ئەم کتێبە بۆ ٥٠ زمانی جیهان وەرگێڕدراوە




# پەیامبەر

وەرگێڕانی:

**توانا ئەمین**




لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی

- ناوی کتێب: پەیامبەر
- بابەت: ئەدەبی فەلسەفیی
- نووسینی: جوبران خەلیل جوبران
- وەرگێڕانی: توانا ئەمین
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپ: یەکەم (٢٠١٧)
- ڕێنووس و هەڵەچن: ئاری عوسمان خەیات
- تابلۆی بەرگ: نیگاری هونەرمەندی فەلەستنی (خالد شاهین).

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٧٩٣)ی ساڵی ٢٠١٦ پێ دراوە.

ناونیشانی ماڵی وەفایی، هەولێر، فلکەی زراعە
https://www.facebook.com/mali.wafai
٠٧٥٠٤٨٢٦٦٤٧

ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە **هەرمێ**

کە ڕۆژێ من دەبمەوە بە بلوور و تۆ دێیت ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، بە ڕۆژێک کە تۆ دەبیتەوە بە بلوور و کەسێکی تر دێت ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە..

ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەوە کراوە بە کوردی:

پیامبر، ترجمه نجف دریابندری
نشر کارنامه، ١٣٩٢
پیامبر، ترجمه دکتر حسین الهی قمشه ای
نشر روزنه
پیامبر، ترجمه د.مهدی مقصودی
نشر گل آفتاب، چاپ پنجم، ١٣٧٦

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا بە زمانی ئینگلیزی نووسراوە و ئەم وەرگێڕانە کوردییەش بەراوردکراوە بەم دەقە ئینگلیزییە:

The Prophet
by Kahlil Gibran

کە لەم ماڵپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە:

http://www-personal.umich.edu/~jrcole/gibran/prophet/prophet.htm

نووسەری خۆشەویستیی،

نووسەری ژیان..

**جوبران خەلیل جوبران کێیە و بۆ ئەم کتێبە؟**

جوبران، نووسەر و هونەرمەند و عارفێکی عەرەبی-ئینگلیزییە، لە ١٨٨٣/١/٦ لە گوندێکی چیایی بەناوی (بوشری) لە باکووری وڵاتی لوبنان لە خێزانێکی مەسیحی لەدایک بووە، برایەکی بەناوی پیتەر شەش ساڵ لەخۆی گەورەتر و دوو خوشکی لەخۆی بچووکتر بە ناوەکانی (ماریانا) و (سوڵتانا) هەبووە. باوکی جوبران پیاوێکی کەمتەرخەم بووە بەرانبەر ماڵومنداڵەکەی، لە کاتێکدا جوبران تەمەنی هەشت ساڵان دەبێ باوکی دەکەوێتە زیندان و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دەست بەسەر ماڵەکەیاندا دەگیرێت، ئەمە وا لە دایکی جوبران دەکات بیر لە جێهێشتنی وڵات بکاتەوە و لە ساڵی ١٨٩٥دا لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا جوبران و دوو خوشک و براکەی و دایکی لە لوبنانەوە بەرەوە ئەمریکا کۆچ دەکەن.

له ئەمریکا له بۆستۆن دەچێته بەرخوێندن، دواتر بۆ ماوەی دوو ساڵ له فەرەنسا هونەر دەخوێنێت و پاشتر دەگەڕێتەوە لوبنان و له ساڵی ١٩٠٢ زانکۆ تەواو دەکات. دوای بیستنی نەخۆشیی ئەندامانی خێزانەکەی له مارسی هەمان ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا، بەڵام سوڵتانەی خوشکی بە نەخۆشیی سیل له تەمەنی ١٤ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و جوبران فریای بینینەوەی ناکەوێت. هەر هەمان ساڵ پیتەری برای بەهەمان نەخۆشیی و دایکی بە شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکەن. ئەم ڕووداوە تراژیدییانە، قورسایی زۆر له ژیانی ڕۆحیی جوبراندا دادەنێن. خۆیشی له تەمەنی ٤٨ ساڵیدا و له ١٩٣١/٤/١٠دا بە نەخۆشیی هەوکردنی جگەر له نیویۆرک کۆچی دوایی دەکات و جەستەکەی دەهێنرێتەوە بۆ زێدی خۆی له لوبنان.

جوبران، له ژیانە کورتەکەیدا هاوسەرێتی نەکرد، پەیوەندیی ئەو لەگەڵ خانمێک بەناوی ماری ئیلزابێز هاسکل پەیوەندییەکی عاشقانە و توندبووە، کە دوای هاوسەرێتیی مارییش؛ له هاوکاریکردنی جوبران و یارمەتیدانی نەکەوتووە، تەنانەت دوای مەرگیشی، ماری له کۆمەکی ڕۆحیی جوبران ناکەوێت و بە هاوکاریی ماریانەی خوشکی

جوبران، تەرمی جوبران لە ساڵی ۱۹۳۲دا دەباتەوە بۆ لوبنان و خانوویەکی تایبەت دەکڕێ لە هەمان گوندی زێدی جوبران و دەیکەن بە مۆزەخانەی جوبران. جێی وتنە بڵێین، پەیوندیی ئەم دوو مرۆڤە پەیوندییەکی بەرز و عاشقانەی بێ سێکس بووە! لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا ماری هاسکل دەستنووسی ٦۰۰ نامەی نێوان خۆی و جوبران پێشکەش بە زانکۆی کارۆلینای باکوور دەکات و دواتر لە ساڵی ۱۹۷۲ بۆ یەکەم جار ئەم نامانە لە شێوەی کتیبێکدا چاپ و بڵاودەکرێنەوە، کە نهێنیی زۆری ژیانی عاشقانەی جوبران و ماری دەدرکێنن.

جوبران، لە خێزانێکی مەسیحی، بەڵام لە وڵاتێکی ئیسلامیدا لە دایک ببوو، پەیوەندیشی لەگەڵ ئاینی بەهایی زۆر بووە، ئەم تێکەڵییە ئاینییە -کە هەر خۆی تایبەتمەندیی ئاینی بەهاییە- ڕەنگدانەوەی لە بەرهەمی جوبراندا زۆر دیارە و ئەو زۆرتر ئەهلی دڵ و زانستی تەسەوف و وردبوونەوەیە لە بوون و ژیان و گەردوون. عەشقی مەعەنەویی، عیرفان، قووڵایی فەلسەفی لە تایبەتمەندییەکانی ناسینەوەی نووسینی جوبرانن و هەر ئەم ئینترەسانتەی جوبرانیش بۆ من جێگەی سەرنج بووە و وایکردووە ئەم کتێبەی وەربگێڕم،

پیاوێک کە لەسەر کۆرەکەی ئەم دێرەی خۆی نووسراوە:...

"من وەک ئێوە زیندووم، چاوتان لێک بنێن لە دەوروبەری خۆتان دەمبینن، من ئەوەتام لەبەردەمتاندا."

کتێبی (پەیامبەر) پێک هاتووە لە ٢٨ گوتاری شاعیرانە، دەرباری ژیان و خوشەویستی و هاوسەرێتی و منداڵ و سامان و بەخشین و... تد، یەکەم جار ساڵی ١٩٢٣ چاپ بووە، ئەم کتێبە کراوە بە تابلۆ، مۆسیقا، لەم ساڵانەیشدا بە فیلمێکی ئەنیمەیشن.

(پەیامبەر) کتێبێکە لەسەر ئاستی فۆرم و تەکنیک سادە و لە ئاستی ناوەڕۆکدا قووڵ و قژقژە، کتێبێکە بۆ هەموو کەسێک دەشێت لە هەر تەمەنێکدا بێت و سەر بە هەر ئاینێک بێت. ئەم کتێبە دوای ئینجیل پڕفرۆشترین کتێبی سەدەی بیست بووە، بەجۆرێک هەتا ئێستا هەفتانە ٥٠٠٠ هەزار نوسخەی لە سەرانسەری جیهاندا لێ دەفرۆشرێت و بۆ زیاتر لە ٥٠ زمانی جیهان وەرگێڕدراوە.

دکتۆر (محمد سلاح عمری) وانەبێژی ئەدەبیاتی عەرەبی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەبارەی ئەم کتێبەوە نووسیویێتی: "ئەمە کتێبێکە لە ساتی زۆر

کرنکدا بە فریات دەکەوێ، باشترین کتێبە وەک دیاریی لەدایکبوون، یان دیاریی دۆستانە لەنێوان دوو خۆشەویست، یان دوو هاوڕێدا ببەخشرێت."

هیوادارم وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ زمانی کوردی، ڕۆحی تەبایی و پێکەوەژیان و خۆشەویستیی لەنێوان خوێنەرەکانیدا زیاد بکات و دڵنیاشم، خوێنەری ڕاستەقینەی دوای ئەم کتێبە، هەمان کەسی پێش ئەم کتێبە نابێت.

توانا ئەمین

ستۆکهۆڵم

کۆتایی ٢٠١٦

موستەفا، هەڵبژێردراوی خۆشەویست، بەرەبەیانی ڕۆژگاری خۆی بوو. دوانزە ساڵ لە شاری ئۆرفالیسدا چاوەڕێی گەڕانەوەی کەشتییەکەی دەکرد، تا بیباتەوە بۆ دوورگەیەک، کە زێدی خۆی بوو.

لە دوانزەهەمین ساڵدا، لە وەرزی خەرمانهەڵگرتندا، لە ڕۆژی حەوتی ئەیلوولدا؛ بەسەر گردی دەرەوەی شورای شاردا سەرکەوت، تەماشایەکی دەریای کرد؛ بینی کەشتییەکەی لەنێو تەمومژدا وا خەریکە دەگاتە کەنار.

ئیدی دەروازەکانی دڵی کرانەوە و خۆشحاڵیشی وەک باڵندەیەک بەسەر دەریادا فڕی، ئەمرا چاوەکانی داخست و لە دڵی خۆیدا سوپاسی بێدەنگیی ڕۆحی کرد.

بەلام کاتێک لە گردەکە هاتە خوارەوە، دڵتەنگییەک سێبەری کردبووە سەری، لەدڵی خۆیدا وتی:

چۆن ئاسوودە و خۆشحاڵ ئێرە جێبهێڵم؟

نەخێر، بێ جێهێشتنی برینێک لە ڕۆحمدا، ئەم شارە جێناهێڵم.

چ ڕۆژگارێکی پڕ ئازارم لەنێو ئەم شارەدا بەسەربرد، چ شەوگارێکی درێژم بەتەنیا تێدا گوزەراند، کێ دەتوانێ دەستبەرداری ئازار و تەنیایی خۆی ببێ و دڵی بۆیان تەنگ نەبێ؟

زۆربەی پارچەکانی ڕۆحم لەم کۆڵانانەدا بەجێ هێشتووە، زۆربەی خواستەکانی منداڵیم بەسەر ئەم گردەدا، بەپێی پەتی هەڵگەڕاون، خۆ ناتوانم بێ خەم لێرە بەجێیان بهێڵم.

ئەمڕۆ ئەمە بەرگێک نییە لەبەری خۆم دایبکەنم، بەڵکوو ئەمە پێستێکە، کە دەبێ بیدڕم. ئەمە خەیاڵێک نییە پشتگوێی بخەم، بەڵکوو دڵێکە، کە شیرینی برسییەتی و تینویەتی چێشتووە.

بەڵام سەرەڕای ئەمەش ناتوانم لەمە زیاتر درەنگ بکەوم، دەریا؛ هەروەک چۆن هەموو شتێک بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، ئاوها منیش

بانک دەکات، دەبێ سواری ئەم کەشتییە ببم، چونکە گەرچی کاتژمێرەکانی شەو سووتێنەرن، بەڵام ئەگەر بمێنمەوە دەیبەستم، دەبم بە بلوور {کریستاڵ} و گەردم تێکەڵی ئەم خاکە دەبێتەوە.

خۆزگە بمتوانیبا هەموو شتێکی ئێرە لەگەڵ خۆمدا بەرم، بەڵام چۆن دەکرێت؟

دەنگ ناتوانێت لێو و زمان لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت، ئەگەرچی ئەمان پەڕوباڵیشیان بەو بەخشیوە. دەبێت تەنها بەدوای ئێکسیرەکەدا بگەڕێم. هەروەک چۆن هەڵۆ، بێلانە و تەنیا ڕووەو خۆر دەفڕێت.

کاتێک گەیشتە دامێنی گردەکە، جارێکی تر ئاوڕی دایەوە بۆ دەریا و تەماشای کەشتییەکەی کرد، کە خەریک بوو دەگەیشتە لەنگەرگاکە، دەریاوانەکان و هاونیشتیمانییەکانی خۆی بینی لە تەختایی کەشتییەکەدا ڕاوێستا بوون.

ڕۆحی گریا و بە دەنگێکی بەرز پێی وتن:

ئەی نەوەی دایکە دێرینەکەم،

ئەی سوارچاکانی شەپۆل.

چەندان جار لە خەونمدا کەشتیتان ئاژوتووە و ئێستا لە بێداریمدا، کە شیرینترین خەونی منە دەگەنەجێ. من ئامادەی ڕۆیشتنم و چارۆکەی هەڵدراوی تاسەم چاوەڕێی با دەکات.

تەنها هەناسەیەکی تر لەم هەوایەدا هەڵدەمژم و بە نیگایەکی سۆزئامێز ئاوڕ بۆ دواوە دەدەمەوە. ئەوکات لەنێو ئێوەدا ڕادەوێستم، وەک دەریاوانێک لەنێو دەریاوانەکاندا.

تۆش، ئەی دەریای پانوبەرین، ئەی دایکی بێ خەو، کە بەتەنیا ئارام و ئازاد دێیت و دەچیت و ڕووبار و جۆگە لە تۆیە، ئەم جۆگەیەش تەنها پێچێکی تری لەبەر ماوە، خووڕەیەکی تری ناو دارستان، ئەوکات منیش بەرەوڕووت دێم؛ وەک دڵۆپێک ئاوی ناکۆتا بۆ نێو زەریایەکی بێکۆتا.

کاتێک هەنگاوی دەنا لە دوورەوە هەندێک ژن و پیاوی بینی لە کێڵگە و ڕەزەکانیانەوە ڕووەو دەروازەی شار تاویان دەدا. هاوارەکانی بیستن، کە لە کێڵگەیەکەوە بۆ کێڵگەیەکی تر بانگیان دەکرد:

کەشتی هات!

ئەویش بە خۆی گوت:

ئایا ڕۆژی دابڕان هەمان ڕۆژی دیدارە؟ ئایا ئێوارەوەختی من، هەمان گزنگی بەرەبەیانی منە؟ کەواتە من چی بەو خەڵکانە بڵێم، کە پێگوشیان[1] وێستاندووە و گاسنیان لەنێو کێڵگەکانیاندا بەجێهێشتووە؟

ئایا دڵی من دەبێتە درەختێکی پڕبەر، تا میوەکەی بچنمەوە و بیبەخشمە ئەوان؟ ئایا خواستەکانم وەک کانییەک هەڵدەقوڵێن، تا گۆزەکانی ئەوانی لێ پڕ بکەم؟

ئایا من چەنگێکم، کە پەنجەی قەدەر تواناکانم دەژەنێت؟ یان شمشاڵێک، کە هەناسەی ئەو بەنێومدا دێت؟ ئایا من گەڕیدەی بێدەنگییم؟ لەم بێدەنگییەمدا چ گەنجێکم دۆزیوەتەوە، کە بەمتمانەوە بەسەر خەڵکیدا دابەشی بکەم؟

ئەگەر ئەمڕۆ ڕۆژی بەرهەم چنینەوەیە؛ لە کام خاک و لە کام وەرزی بیرچووەوەدا؛ تۆوەکەیم وەشاندووە؟

---

[1] - پێگووش: کەرستەی گرتنی ئاوی ترێ. (و)

ئەگەر بەڕاستی ئەمە ئەو ساتە بێت، کە دەبێت چراکەمی تێدا بەرز بکەمەوە، ئایا ئەوەی لەناو چراکەدا دەگرێت ئاگری منە؟

من ئەو چرا خاڵی و خامۆشە بەرز دەکەمەوە، کە دەبێ پاسەوانی شەو پڕ ڕۆنی بکات و دایگیرسێنێت.

ئەوە قسەکانی سەر زاری بووم، بەڵام زۆر قسەی تری لە دڵدا مابوو، کە نەیدەتوانی دەریانبڕێت، چونکە نەیدەتوانی نهێنیی دەروونی خۆی بهێنێتە زمان، کە ڕووەو شار ڕۆیشت، هەموو خەڵک لە پێشوازیدا بەرەو پیریی هاتبوون و بەیەک دەنگ هاواریان بۆ دەکرد.

پیرانی شار هاتنە پێشەوە و وتیان:

بەجێمان مەهێڵە، تۆ دڵنەوایی نیوەڕۆیەک بوویت لە بەرزەخی بیرەنگیماندا، لاوێتیت شکۆی خەیاڵێک بوو لە خەونە ئاڵۆزەکانماندا. تۆ لەنێو ئێمەدا نە بێگانەیت و نە میوانی، تۆ کوڕی شیرینی ئێمەیت، ئێستایش مەهێڵە چاومان تینووی دیدارت بێت.

ژن و پیاوانی ڕۆحانییش وتیان:
مەهێڵە شەپۆلەکانی دەریا تۆ لە ئێمە بکات و سالانی مانەوەت؛ تەنها ببێت بە یادگارییەک. تۆ ڕۆحێک بوویت بەنێوماندا دەگەڕایت، سێبەرت نوورێک بوو ڕووخسارمانی ڕووناک دەکردەوە.
ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، گەرچی سۆزی ئێمە لالە و تارایەک بەسەر ڕووخسارییەوەیە، لێ ئێستا تۆ بە دەنگێکی بەرز بانگ دەکات و لەبەردەمتدا ڕووت دەبێتەوە.

هەمیشە وا بووە، کە خۆشەویستی قووڵایی خۆی نازانێت، تا ساتی ماڵئاوایی و جیابوونەوە. خەڵکانی تریش هاتن و لێی پاڕانەوە، بەڵام ئەو وەڵامی نەدانەوە، تەنها سەری دانەواند، ئەو کەسانەی لەبەردەمیدا ڕاوێستابوون؛ بینییان فرمێسک لەچاوییەوە تکایە سەر سینەی.
ئەمڕا ئەو، خەڵکەکەی بەرەو گۆڕەپانی مەزنی بەردەم پەرستگا برد. لە میحرابی پەرستگاکەوە؛ ژنێک بە ناوی (میترا) هاتە دەرەوە، کاری ئەو ژنە پێشبینیکردن بوو.

ئەم بە میهرەبـانییەوە لێـی ڕوانـی، چـونکە میتـرا یەکەم کەس بـوو، کە هەمـان ئەو ڕۆژەی ئەم پێـی خسـتە ئەم شـارە، ئەو بەرەو پیریـی ڕۆیشت و بڕوای پێ هێنا.

ژنەکە سڵاوی لێ کرد و وتی:

ئەی پەیـامبەری خـوا، سـاڵهای سـاڵ چاوەڕێی کەشـتییەکە بوویـت، ئێسـتایش هـاتووە و دەبێـت بڕۆیـت، تاسـەیەکی قووڵـت بـۆ نیشـتیمانی یادگارییەکانـت و شـوێنگەی خواسـتە مەزنەکانـت هەیە. سـۆزی ئـێمە نـابێتە ڕێگـر و ویستیشـمان تـۆ نـاگەڕێنێتەوە، بەڵام بەرلەوەی ئـێمە جێبهێڵێـت؛ داوات لـێ دەکەیـن هەندێک شتمان فێر بکەیت.

خۆمـان لە خۆمـان ئاشـکرا بـکە، ئـێمەیش ئەم ڕاسـتییە بـۆ نەوەکانمـان دەگێـڕینەوە و ئەوانـیش بـۆ نەوەکانیـان بگێـڕنەوە تـا هەرگیـز لەناو نەچێت.

تـۆ لە تەنیاییتـدا، ڕۆژگـاری ئـێمەت دیـوە و لە بێدارییتـدا، گریـان و پێکەنیـنە شـاراوەکانی ئێمەت ژنەفتووە.

کەواتە ئێستا خۆمان لە خۆمان ئاشکرا بکە و لەبارەی ئەوەی لەنێوان لەدایکبوون و مەرگدا ڕوودەدات فێرمان بکە.

ئەویش وەڵامی دایەوە:

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس، من دەربارەی چی دەتوانم بۆ ئێوە بدوێم، جگە لەوەی کە لە ڕۆحتاندا دەگوزەرێت؟

ئەوجا میترا وتی:

"لەبارەی خۆشەویستییەوە بۆمان بدوێ."

ئەو سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی خەڵکەکەی کرد، کە بێدەنگیی باڵی بەسەردا کێشابوون، ئەمڕا بەدەنگێکی بەرز وتی:

کاتێک خۆشەویستی سەراپاتان دەتەنێت؛ شوێنی بکەون، هەرچەند ڕێگەیەکی دژوار و ناهەموارە، کە باڵی بۆ کردنەوە؛ ئێوەیش لە ئامێزی بگرن، ئەگەرچی ڕەنگە شمشێرێک لەنێو پەڕەکانیدا شاردرابێتەوە و برینداریشتان بکات.

کە قسەتان لەگەڵ دەکات، گوێی بۆ ڕادێرن، ئەگەرچی ڕەنگە؛ دەنگەکەی خەونەکانتان وردوخاش بکات، هەروەک چۆن بای باکووریی، باخەکان وێران دەکات. چونکە خۆشەویستی ئەوکاتەی تاجی شادییتان دەخاتە سەر سەر، لە خاچیشتان دەدات.

هەروەک چۆن پەروەردەتـان دەکـات تـاواش هەرەسـتـان پـێ دەهێنێـت. هەروەک چۆن بەباڵاتاندا هەڵـدەزنێ و ناسـکترین چڵتـان لە خۆرەتـاودا دەلەرزێنێـت، هێنـدەش بە رەگوڕیشـەتاندا ڕۆدەچێـتە خـوارێ و ڕاتـان دەوەشێنێت.

وەک گەنمەشـامی لە باوشـتـان دەگرێـت. لەبێژنگتـان دەدات و لە توێکڵەکانتـان ئازادتـان دەکـات. دەتانهـاڕێ و دەتانکـات بە ئـارد. دەتانکـات بە هەویـر و دەتانشـێلێت. ئەوکـاتیش دەتانسـپێرێت بە ئـاگری پیـرۆز خـۆی، تـا نانێکی پیرۆزتـان لـێ دەربچێـت، لەسـەر خـوانی موبارەکی خوداوەند.

خۆشەویسـتـی هەمـوو ئەوانەتـان بەسـەردا دێنێـت تـا پەی بە نهێنیـی دڵتـان ببەن و بەم زانستەوە بگۆڕێن بۆ پارچەیەک لە ژیان.

بەڵام ئەگەر دەترسـن و تەنهـا بەدوای ئـارامیی و چێـژی خۆشەویسـتیدا دەگەڕێـن؛ ئەوا چـاکتر وایە جەسـتەی ڕووتتـان داپۆشـن و لە تیغـی تیـژی خەرمـانکوتی خۆشەویسـتـی دوور بکەونەوە.

ڕوو بـکەنە ئەو جیهـانە بـێ وەرزەی کە تێیـدا پێـدەکەنن، بەڵام تەواوی پێکەنینـەکەی خۆتـان

ناهێننه سەرلێو، دەیشکرێن، بەلام هەموو فرمێسکەکانتان نارژێن.

خۆشەویستی نه هیچ دەبەخشێت جگه له خۆی و نه هیچیش وەردەگرێت جگه له خۆی.

خۆشەویستی نه بەندی موڵکه و نه سەودای خاوەنداریێتی. خۆشەویستی لەسەر بنەمای خۆشەویستی پایەداره.

کاتێک ئەڤیندار دەبن، مەڵێن: (خوداوەند له دڵی مندایه)، بەڵکوو بڵێن: (من له دڵی خوداوەند دام).

وا گومان مەکەن، که دەتوانن خۆشەویستی بەرێوەببەن، چونکه ئەگەر خۆشەویستی ئێوه به شایسته بزانێت، ئەو بەرێوەتان دەبات.

خۆشەویستی خۆی ئارەزووه، هیچ ئارەزوویەکی تری نییه، جگه لەوەی خۆی بهێنێته دی، بەڵام ئەگەر خۆشەویستیتان کرد، دەبێت خواستێکتان هەبێت، رێگه بدەن با ئەمانه خواستەکانتان بن:

بتوێنەوه و ببن به ئاو، وەک ئەو جۆگەیه رەوان بن، که گۆرانیی بۆ شەو دەڵێت.

ئامادەبن ئازاری زیاتر له سۆز تێدا وەربگرن، چونکه زام تێگەیشتنه له خۆشەویستی.

چێژ لەم خوێنبەخشینە ببەن:

سپێدان بێدار بن بە دڵێکی ئامادەوە بۆ فڕین؛ سوپاسی خوداوەند بکەن بۆ ڕۆژێکی تری خۆشەویستی. لەنیوەڕواندا ئاسوودەبن و بەقووڵایی خۆشەویستیدا ڕۆچن. ئێواران بەسوپاسەوە بۆ ماڵەوە بگەڕێنەوە.

ئەو کاتەشی دەچنە جێگا و دەتانەوێ بنوون؛ بە ئاوازی ستایشئامێز نزا بۆ ئەو کەسە بکەن، کە خۆشتان دەوێ.

لەم کـاتەدا میتـرا جـارێکی تـر هـاتەوەگۆ و وتـی: "دەربـارەی هاوسـەرێتی بۆمـان بـدوێ، ئەی مامۆستا."

ئەویش وەڵامی دایەوە:

ئێوە پـێکەوە لەدایـک دەبـن و بـۆ هەمیشـە پـێکەوە دەمێنـنەوە، تـا ئەو کـاتەی بـاڵە سـپییەکانی مەرگ لەیەکتـان جیادەکـاتەوە. بەڵـێ، ئێـوە تەنـانەت لە یـادگەی بێـدەنگی خواوەندیشدا پێکەوەن.

بەڵام کاتێـک پـێکەوەن؛ مەودایەک لە نێوانتـان ڕاگـرن، بهـێڵن باکـانی ئاسـمان لە نێوانتانـدا سەما بکەن.

لەگەڵ یەکتـردا خۆشەویسـتی بـکەن، بەڵام لە خۆشەویسـتیتاندا؛ کۆسـپ بـۆ یەکتـر دروسـت مەکەن. بهـێڵن خۆشەویسـتی وەک دەریـایەک لەنێـوان کەنـاری ڕۆحـی هەردووکتانـدا شـەپۆل بدات.

جامی یەکتر پڕ بکەن، بەلام لە یەک جام مەخۆنەوە. نانی خۆتان بە یەکتر ببەخشن، بەڵام لە یەک تیکە نان مەخۆن.

پێکەوە گۆرانیی بڵێن و سەما بکەن و شادبن، بەڵام ڕێزی تەنیایی یەکتر بگرن، هەر وەک چۆن تاڵەکانی عود جیان، بەڵام بۆ ژەنینی ئاوازێک پێکەوە دەبزوێن.

دڵی خۆتان بە یەکتری ببەخشن، بەڵام نەک بۆ پاراستن، چونکە تەنها دەستی ژیان دەتوانێت بتانپارێزێت.

لە کەنار یەکتردا بوەستن، بەڵام مەنووسێن بەیەکەوە، چونکە پایەکانی پەرستگا لە دوور یەکەوە ڕاوەستاون.

پێکەوە بن، بەڵام مەچنە ژێر سێبەری یەک، ئاخر چنار و داربەڕوو لەژێر سێبەری یەکتردا گەشە ناکەن.

لەم کاتەدا ژنێک، کە منداڵێکی ساوای بەباوشەوە بوو، وتی: "دەربارەی منداڵ قسەمان بۆ بکە."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

منداڵەکانی ئێوە، منداڵی ئێوە نین، ئەوان کوڕ و کچی خواستێکن، کە ژیان لەخۆی دەگرێت. ئەگەرچی منداڵەکانتان لەڕێی ئێوەوە دێنە جیهانەوە، بەڵام لە ئێوە نین. سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ ئێوەدان، بەڵام موڵکی ئێوە نین.

ئێوە دەتوانن خۆشەویستی خۆتانیان بدەنێ، بەڵام هەرگیز ناتوانن ئەندێشەکانتانیان بەسەردا بسەپێنن، چونکە ئەوان ئەندێشەی تایبەت بەخۆیان هەیە.

ئێوە دەتوانن جەستەیان لەماڵەوە زیندانی بکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن ئەوە لەگەڵ ڕۆحیاندا بکەن، چونکە ڕۆحیان لە ماڵی

سـبەینێ دایە و ئێـوە هەر بە خەویـش ڕێتـان لەو ماڵە ناکەوێت.

ئێـوە دەتـوانن هەوڵ بـدەن خۆتـان وەک ئەوان لـێ بـکەن، بەڵام هەوڵ مەدەن ئەوان وەک خۆتـان لـێ بـکەن، چـونکە ژیـان نە بـۆ دواوە دەگەڕێتەوە و نە لەمرۆدا دەوەستێت.

ئێـوە کەوانـێکن، منـداڵەکانتان وەک تیرێـک بە ئێـوەدا دەهاوێژرێـت، تیرهـاوێژ؛ نیشـانەکەی لە ڕێڕەوێکـی بێکۆتاییـدا دەبینێـت، ئەوجا کەوانـی خـۆی دەچەمێنێـتەوە و تیـر تیـژپەڕانە بەهەوادا دەفڕێت.

بهـێڵن چەمـانەوەتـان بە دەسـتی تیرهـاوێژەوە خۆشـحاڵانە بێـت، چـونکە ئەویـش بەو تیـروکەوانەی بەدەسـتییەوەیەتی خۆشەویسـتی دەهاوێژێت.

لەم کاتەدا پیاوێکی دەوڵەمەند وتی:
"لەبارەی بەخشینەوە قسەمان بۆ بکە."
ئەویش لە وەڵامدا وتی:
هەرچی لەسەروەت و سامان دەیبەخشن کەمە و ئەوەی لە ڕۆحتان دەیبەخشن زۆرە، چونکە موڵک و ماڵ چییە جگە لەو شتەی دەیشارنەوە بۆ سبەی؟
سبەی چ سوودێکی هەیە بۆ ئەو سەگە قایمکارەی کە ئێسقانێک لەژێر لمی بێ ناونیشانی بیابانێکدا دەشارێتەوە و ئینجا دوای کاروانی دیدەنیکاران دەکەوێت بۆ شاری پیرۆز؟
ئایا ترس لە پێویستی، هەمان پێویستی نییە؟ ئایا ترس لە تینوێتی لە کاتێکدا کانییەک پڕ لە ئاوە، ترس لە تینوێتی تێرنەبوون نییە؟

خەلکانێک هەن، زۆریان هەیە و کەم دەبەخشن، بۆ ناو و ناوبانگ دەبەخشن، ئەم خواستە شاراوەیەی بەخشینیش ئالوودەیان دەکات.

خەڵکانێکیش هەن، کەمیان هەیە و هەمووی دەبەخشن، ئەم جۆرە کەسانە باوەڕیان بە ژیان و بەرەکەتی ژیان هەیە و هەرگیز دەستیان خاڵی نابێت.

خەڵکانێک هەن، بە خۆشحاڵییەوە دەبەخشن و پاداشتیان شادیی دەبێت، خەڵکانێکیش هەن، بە ئازارەوە دەبەخشن و ئەو بەخشینە پاکیان دەکاتەوە.

خەڵکانێکی تر هەن، دەبەخشن و لەم کارەیان نەچێژ وەردەگرن و نە ئازار دەچێژن، تەنانەت نیازی پاداشتیشیان نییە، ئەم جۆرە کەسانە وەک ئەو درەختە وان، کە لە دەربەندێکی دوورەوە عەتری خۆی بە نەسیم دەبەخشێت و هەوا بۆنخۆش دەکات.

لە شکۆی دەستی ئەم کەسانەیە، خوداوەند دێتە گفتوگۆ و لەودیو چاوی ئەم کەسانەوە زەردەخەنە بۆ زەوی دەکات.

بەخشین لەبەرانبەر داوالێکردندا چاکەیە، بەڵام بەخشینی بێ داوالێکردن و لە

هۆشیاریی خۆتانەوە چاکترە. بۆ بەخشندەکان، بەهای بەدەستهێنانی شادیی خەڵک لە شادیی بەخشین زیاترە.

ئایا شتێک شک دەبەن، کە نەتوانن بیبەخشن؟ ئەوەی لەئێستادا هەتانە، ڕۆژێک دەبێت بیبەخشن، کەواتە چاکتر وایە هەر ئەمڕۆ ئەو کارە بکەن، بۆ ئەوەی وەرزی بەخشین لە تۆوە دەست پێ بکات، نەک لە میراتخۆرەکانەوە.

ئێوە زۆرجار دەڵێن: (دەیبەخشین، بەڵام بەو کەسەی کە شایستەیە)، کەچی درەختی بەرداری باخەکانتان وا ناڵێن، ئەوان دەبەخشن، چونکە دەزانن بەخشین ژیانە و نەبەخشین مەرگ.

بێگومان ئەو کەسەی شایستەی شەو و ڕۆژ بێت، بەهەمان شێوە شایستەی بەخشینی تۆیە. ئەو کەسەش شایستەی خواردنەوەی ئاوی دەریای ژیان بێت، شایستەی ئەوەیە جامی خۆی لەو جۆگە باریکەی تۆ پڕ بکات.

کام تاوان لەو تاوانە مەزنترە؛ لەبەرانبەر کەسێکدا، کە بەدڵنیاییەوە پێویستی بە بەخشینی تۆیە، پێی بڵێیت نەخێر؟

مەگەر تۆ كێیت، كە دەبێت خەڵكی یەخەی خۆیانت بۆ دادڕن و تارا لەسەر شكۆیان لابدەن، تا تۆ بەهایان ڕووت و شكۆیان بێشەرم ببینی؟

یەكەمجار خۆت هەم بەخشیندە بە و هەم شایستەی بەخشین بە، چونكە ئەوە ژیانە، كە دەبەخشێت و تۆ، كە خۆت بە بەخشیندە دەزانی جگە لە شایەتێك زیاتر هیچی تر نیت.

ئێوەیش ئەی ئەوانەی بەخشین وەردەگرن، وەریبگرن و سوپاسگوزار مەبن، نەوەك بارێكی قورس بخەنە گەردنی خۆتان و بەخشیندەكەیشەوە. لەگەڵ بەخشیندە بەسەر باڵی بەخشینەوە هەردووكتان بفڕن، زیادەڕەویی لەسوپاسكردندا، گومانكردنە لە گەوهەری بەخشیندەیی، كە دایكێكی میهرەبانی وەك زەوی و باوكێكی مەزنی وەك خوداوەندی هەیە.

لەم کاتەدا پیرەمێردێکی خاوەن کاروانسەرا وتی: "دەربارەی خواردن و خوارنەوە بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

خۆزگە بتانتوانیبا بە عەتری خاک بژین، هەروەک چۆن ڕووەکەکان بە تیشکی خۆر دەژین.

بەڵام لەبەر ئەوەی لەپێناو خواردندا دەبێت بکوژن و تینوێتیی خۆتان بە بڕینی شیری دایک لە منداڵ بشکێنن، کەواتە ئەم کارە وەک پەرستشێک ئەنجام بدەن.

لێگەڕێن لەپێناو ئەو شتەی کە لە بوونی مرۆڤدا پاکتر و بێگوناهترە، سفرەکانتان میحرابێک بن بۆ قوربانیکردنی بێزمانە پاک و بێگوناهەکانی دەشتودەر.

کاتێک گیانەوەرێک سەردەبڕن، لە دڵی خۆتدا پێی بڵێن: "هەمان ئەو هێزەی تۆ دەکوژێت،

منیش دەکوژێت، هەمان ئەو یاسایەی تۆی گرفتاری دەستی من کردووە؛ منیش گرفتاری دەستێکی بەتواناتر دەکات. خوێنی تۆ و خوێنی من نییە، ئەوەی دەڕژێ شیلەی ڕەگی داری بەهەشتە."

کە گاز لە سێوێک دەگرن لە دڵی خۆتاندا پێی بڵێن: "تۆوەکانت لە جەستەی مندا دەڕوێن و چرۆکانی سبەینێت لە دڵی مندا دەپشکوێن، عەتری تۆ دەبێ بە هەناسەی من و ئیتر من و تۆ لە هەموو وەرزەکاندا پێکەوە ئاهەنگ دەگێڕین."

پایزان کاتێک ترێی ڕەزەکانتان بۆ گووشین دەچنن، لە دڵی خۆتاندا پێی بڵێن: "من وەک تۆ ڕەزێکم، میوەی منیش بۆ گووشین کۆدەکەنەوە و مینا شەرابێکی نوێ لە گۆزەی هەمیشەییدا دەمێنمەوە."

زستانانیش کاتێک شەراب لە گۆزەوە دەکەنە نێو جامەکانتانەوە؛ بهێڵن دڵتان بۆ هەر پێکێک گۆرانیی بڵێت، لێگەڕێن هەر گۆرانییەکتان یادێک بێت بۆ ڕەزەکانتان، بۆ ڕۆژانی پایز، بۆ ڕۆژانی ترێگووشین.

لەم کاتەدا جووتیارێک وتی:

"دەربارەی کار بۆمان بدوێ."

ئەویش وەڵامی دایەوە:

ئێوە کار دەکەن تا هاوڕێی زەوی و ڕۆحی زەوی بن، چونکە بێکاریی واتا نامۆبوون بە وەرزەکان و دواکەوتن لە ڕەوتی ژیان، کە شکۆدارانە و سەربەرز بە ئاراستەی جاویدانی هەنگاو دەنێت.

ئەو کاتەی کار دەکەن وەک شمشاڵێک وان، کە سرتە و چپەی ساتەکان لە دڵی خۆیدا دەگۆڕێت بە ئاوازێکی دڵڕفێن. کێ لە ئێوە حەز دەکات شمشاڵێکی بێدەنگ بێت، کاتێک هەموو خەڵکی پێکەوە گۆرانیی دەچڕن؟

هەمیشە پێیان گوتوون، کار نەفرەت و بەدبەختییە، بەڵام من پێتان دەڵێم کار؛ دوورترین خەونەکانی زەویتان بۆ دەهێنێتەدی، کە لەساتی لەدایکبوونتانەوە

بۆتـــان دیـــاریکراوه. به کارکردنتـــان خۆشەویســـتی لەگەڵ ژیانـــدا دەکەن، خۆشەویســتی کــردن لەگەڵ ژیانــدا لەڕێگــای کــارەوە؛ واتە پەیبــردن بە شــاراوەترین نهێنیــی ژیان.

بەڵام ئەگەر شــکۆی هــاتنەبوون بە ئــازاری نەفرەتێــک تێــدەگەن، کە لەســەر نێوچەوانتــان نووســراوە، ئەوا مــن پێتــان دەڵـێم؛ هیـچ شتێک جـگە لە عەرەقــی نــاوچەوان ئەو نووســراوە ناشواتەوە.

هەروەک چـۆن پێیــان گوتــوون؛ ژیــان تــاریکە، ئێــوەیش، کە مانــدوو دەبــن هەر ئەوە دووبــارە دەکەنەوە، کە مانــدووەکان دەیڵــێن، منــیش پێتان دەڵێم:

بەڕاســـتی ژیـــان تـــاریکە، مەگەر ئەوەی کە ئــارەزوویەک ڕوونــاکی بکــاتەوە، ئــارەزوویش هەمیشـــە کــوێرە، مەگەر ئەوەی کە زانســـتێک ببێتە چاوساغی.

زانســـتیش هەمیشـــە بێهـــوودەیە، مەگەر ئەوەی کارێــک بیهێنێــتە بەرهەم، کــاریش هەمیشـــە بەتـــاڵە، مەگەر ئەوەی خۆشەویســـتییەک پڕی بکاتەوە.

هەرکاتێکیش بە خۆشەویستییەوە کار بکەن، خۆتان بەیەکتر و بەخواوەندیشەوە گرێ دەدەن.

بەڵام کارکردن بەخۆشەویستییەوە یانی چی؟

کارکردن بەخۆشەویستییەوە، یانی چنینی پارچە قوماشێک، کە تانوپۆی تاڵەکانی لەدڵتەوە بۆ دەرکێشیت، هەروەک بڵێی ئەو پارچەیەت بۆ دڵدارەکەت دەوێ.

کارکردن بەخۆشەویستییەوە، یانی دروستکردنی خانوویەک لە خۆشەویستی، هەروەک بڵێی خۆشەویستەکەت دێت و لەم خانووەدا نیشتەجێ دەبێت.

کارکردن بەخۆشەویستییەوە، یانی ناشتنی تۆو بە خۆشەویستییەوە، هەروەک بڵێی خۆشەویستەکەت دێت و بەری ئەم تۆوە دەچنێتەوە و دەیخوات.

کارکردن بەخۆشەویستییەوە، یانی پێدانی ڕۆحی خۆت بەو گۆزەیەی دروستی دەکەیت، هەروەک بڵێی ڕۆحی پاکی هەموو مردووەکانت لێت کۆبوونەتەوە و تەماشات دەکەن.

چەند جارێک لە ئێوەم بیستووە، هەروەک بڵێی لە خەودا وڕێنە بکەن، دەڵێن:

ئەو کەسەی کار لەسەر مەڕمەڕ دەکات و شێوەی ڕۆحی خۆی لێیان دادەتاشێت، خانەدانترە لەو کەسەی کە زەوی دەکێڵێت."

یان دەڵێن: "ئەو کەسەی لە ڕەنگی پەلکەزێڕینە وێنەی مرۆڤ لەسەر پارچە قوماشێک دەکێشێت، خانەدانترە لەو کەسەی کە پێڵاوەکانمان دەدورێتەوە."

بەڵام من لە خەودا نا، بەڵکوو لە بێداریی نیوەڕۆدا پێتان دەڵێم؛ دەمەتەقێی (با) لەگەڵ داربەڕوودا شیرینتر نییە لە دەمەتەقێی (با) لەگەڵ تاڵی گیایەکدا.

مەزنیی تەنها موڵکی کەسێکە؛ گۆرانییەک لە گڤەی (با) دروست بکات لە سۆزی خۆی شیرینتر بێت.

کار وەک خۆشەویستی خۆی نمایش دەکات.

تۆیش ئەگەر ناتوانی بەخۆشەویستییەوە کار بکەیت، ئەگەر نەفرەت دەکەیت و پرتەوبۆڵەتە لێی؛ وەها باشترە دەست بکێشیتەوە و بچی لە دەرگای پەرستگایەکدا دانیشی سواڵ بکەیت و چاوەڕێی دەستی ئەوانە بکەیت کە بە خۆشحاڵییەوە کار دەکەن.

چونکە ئەگەر بەنابەدڵی نانێک ببرژێنیت،
دەیسووتێنیت و تاڵی دەکەیت؛ وەها کە
بخۆرەکەی ناتوانێ هەمووی بخوات و پێی تێر
ببێت.

ئەگەر بەڕقەوە ترێ بگووشیت، ڕقت وەک
ژەهر دەڕژێتە نێو شەرابەکەوە.

ئەگەر وەک فریشتەیش گۆرانیی بڵێیت و
بەڵام بەخۆشەویستییەوە نەیچڕی؛ ئەوا گوێی
خەڵکی دەئاخنی بە دەنگی شەو و ڕۆژ.

لەم کاتەدا ژنێک هاتەگۆ و وتی:

"دەربارەی خەم و شادیی بۆمان بدوێ."

ئەویش لەوەڵامدا وتی:

شادیی ئێوە هەمان خەمی بێ ڕووپۆشی ئێوەیە. ئەو چاڵەی پێکەنینتانی لێوە هەڵدەقووڵێت، هەمان ئەو چاڵەیە، کە بە فرمێسکتان پڕ بووە. بۆ لەمە زیاتر دەتوانێ چی تر بێت؟

هەرچەندێک خەم؛ دەروونتان زیاتر هەڵبکۆڵێت، جێگای شادیی لە بوونتاندا زیاتر دەکات. مەگەر ئەو کاسەی شەرابی ئێوەی لەخۆگرتووە هەمان ئەو کاسەیە نییە، کە لە کوورەی گۆزەگەردا سووتێنراوە؟

مەگەر ئەو عودەی کە بە دەنگەکەی ئارامیی بە ڕۆحتان دەبەخشێ هەمان ئەو پارچە دارە نییە، کە بە چەقۆ ناوەکەیان هەڵکۆڵیوە؟

هەر کاتێ شادبوون، بڕواننە قووڵایی دڵتان، تابزانن؛ ئەوەی کە سەرچاوەی شادییە، هەمان ئەو شتەیە، کە سەرچاوەی خەمیشە.

بەهەمان شێوە کاتێک خەمبار دەبن؛ بڕواننە قووڵایی ڕۆحی خۆتان، تا بزانن ئەوەی ئێستا بۆتە مایەی گریانی ئێوە ئەو شتەیە، کە پێشتر خۆشحاڵی کردوون.

هەندێک لە ئێوە دەڵێن: "شادیی مەزنترە لە خەم"، هەندێکیشتان دەڵێن: "نەخێر خەم مەزنترە لە شادیی."

من پێتان دەڵێم: ئەم دووانە لەیەک جیانین.

ئەم دووانە هەمیشە پێکەوەن، هەرکاتێک یەکێکیان لەسەر سفرەکەتان لەگەڵتاندا دانیشت، بزانن کە ئەوەکەی تریان لە جێخەوەکەتاندا نووستوە.

ئێوە وەک ترازوویەک وان لەنێوان شادیی و خەمدا، تەنها ئەو کاتەی خاڵیین؛ هاوسەنگ دەبن.

هەر کاتێک خەزنەدارێک زێڕوزیوەکەتان بۆ دەکێشێت، ئێوە پێویستتان بە لێدەرهێنان یان زیادکردنی شادیی و خەمەکانتان دەبێت.

لەم کاتەدا بیناسازێک وتی:

"لە بارەی خانووەوە بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

لە خەیاڵتاندا کەپرێک لە بیاباندا دروست بکەن، بەرلەوەی خانوویەک لە شاردا دروست بکەن، چونکە ئێواران دەگەڕێنەوە ماڵەوە، ئەو تەنیایی و وێڵییەی لەنێو ئێوەیشدایە دەگەڕێتەوە.

ماڵی هەر کەسێک هەمان جەستەی خۆیەتی، بەڵام گەورە و فراوانتر. ئەم ماڵە لە خۆرەتاودا گەشە دەکات و لە ئارامیی شەودا دەنوێت و خەوی بێ خەونی نییە، ئایا خانووەکانتان خەون نابینن؟ لە خەونەکانیاندا لە شارەوە بۆ ناو باخ و گردەکان ناڕۆن؟

خۆزگە بمتوانیبایە خانووەکانتانم لەنێو دەستمدا کۆ بکردایەتەوە و وەک تۆو لە دەشت و دارستانەکاندا بموەشاندبا.

خـۆزگە لە دەربەندەکانـدا، لە کۆڵانەبـاخە

سـەوزەکاندا تووشـتان ببـایە بەتووشـی

یەکتـرەوە و لە ڕەزەکانتانـدا سڵاوتان لەیەکتـر

بکردبـایە و بە بـۆنی خـاکەوە پـێکەوە

بگەڕانایەتەوە. بەڵام ئەمە لەئێستادا ناکرێت.

باپیرانتـان لەترسـدا خانووەکانیـان لەتەنیشـت

یەکتـرەوە دروسـت دەکـرد، ئێـوە بەنیـازن تـا

کەی ترسـتان، حەسـاری ماڵەکانتـان لە

کێڵگەکانتان جیابکاتەوە؟

ئەی خەڵکـی ئۆرفـالیس؛ پـێم بڵـێن ئێـوە

چیتـان لە مـاڵەوە هەیە؟ ئەو شـتە چییە لە

ماڵەکانتانـدا شـاردووتانەتەوە و دەرگاتـان

بەسـەردا گـاڵەداوە؟ ئایـا لە ئارامییدا دەژیـن و

ئەمەیە، کە تواناکانتان ئاشکرا دەکات؟

ئایـا یادگـارییەکی وەهاتـان لەماڵەکانتانـدا

هەیە، کە وەک پردێکـی درەخشـان ترۆپکـی

هۆشتان پێکەوە ببەستێتەوە؟

ئایا جـوانییەکی وەهاتـان هەیە، کە دڵـی ئێوە

لە کەرەسـتە داروبەردەکانتـانەوە بەرەو

لووتکەی چیای پیرۆز ببات؟

ئـادەی پـێم بڵـێن، ئایـا ئەمانەتـان لە

ماڵەکانتاندا هەیە؟

یـان تەنهـا ئـارامییەکی درۆزنتـــان هەیە، کە چێـژەکەی یەکجـار بە میوانیتـان دێـت و ئیتـر هەتاهەتـــایە نـــاڕوات و لێتـــان دەبێـــت بە خاوەنماڵ؟

بەڵـــێ، ئەوە دێـــوێکە دێـــت و بەزەبـــری قـامچییەکەی دەتانکـات بە بـووکەڵەی خواسـتە زۆرەکـــانی خـــۆی. ئەگەرچـــی دەســـتێکی ئاوریشـمینی هەیە، بەڵام دڵـی لە ئاسنە. ئێـوە دەخـــاتە خەو و خـــۆی بەســـەر ســـەرتانەوە دەوەستێ و گـاڵتە بە شکۆمەندیی جەسـتەتان دەکات.

گـــاڵتە بە هەســـــتەکانتان دەکـــات، بە تەندروســتیی دەنگتــان و وەک قـاپێکی شـکاو هەڵی دەداتەوە ناو زبڵوزارەوە.

بەڕاســـتی چێـــژی درۆزنـــانەی ئـــارامیی ماڵەکانتـــان، ڕۆحتـــان دەکوژێـــت و ئینجــا بە بزەیەکـــی پـڕ ســـووکایەتییەوە دێـــت بـــۆ پرسەکەی.

بەڵام ئێـــوە، ئەی منـــداڵانی ئاســـمان، ئەی ئەوانەی ئارامتـــان نییە، بەداوەوە نەبـــن و ڕاو نەکرێن.

ماڵەکانی ئێوە نابێت لەنگەری کەشتیی بێت، بەڵکوو دەبێت ئەو دارە بێت، کە چارۆکەی کەشتیی پێوە هەڵدەدرێت.
ماڵەکانتان نابێت ئەو مەرهەمە بێت، کە رووپۆشی برینێک دادەپۆشێت، بەڵکوو دەبێت ئەو پێڵوە بێت، کە پارێزگاریی لە چاو دەکات.
با دەرگای ماڵەکانتان هێندە بچووک نەبێت، ناچاربن باڵەکانتانی بۆ بنووشتێننەوە، کاتێک لێوەی تێدەپەڕن.
با ساپیتەکانتان هێندە نزم نەبێت، ملتانی بۆ کەچ بکەن. هەناسەتان ئازاد بێت و نەترسن لەوەی درزبخاتە دیوارەکانەوە.
ماڵەکانتان شوێنی نیشتەجێبوونی ئێوەن و با وەک گۆڕی مردوو نەبێت.
خانووەکانتان هەر چەند بەرز و جوان بن، بەڵام نهێنیی و ئارەزووەکانتان ناشارنەوە، چونکە ئەوەی لە بوونی ئێوەدا ناکۆتایە لە کۆشکی ئاسماندایە، کە دەروازەکەی تەمومژی بەرەبەیان و پەنجەرەکانیشی سرووەی بێدەنگی شەون.

لەم کاتەدا جۆلایەک وتی:

"دەربارەی جلوبەرگ بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

پۆشاکەکانتان جوانییەکانتان دەشارێتەوە و ناشیرینییەکانتان دەخاتەڕوو. سەرەڕای ئەوەی لەناو پۆشاکەکانتاندا بەدوای ئازادییدا دەگەڕێن، بەڵام تەنها پێوەند و زنجیری تێدا دەدۆزنەوە.

زیاتر پێستی خۆتان بدەنە بەر تیشکی خۆر و شنەی با و کەمتر بە پۆشاک دایپۆشن، چونکە هەناسەی ژیان وا لە تیشکی خۆر و دەستی ژیان وا لە شنەی بادا.

هەندێکتان دەڵێن: "ئەم پۆشاکەی لەبەرماندایە بای باکوور چنیویەتی"، بەڵام بزانن؛ خەراتەکەی شەرم و تاڵەکانی ئابڕوو بووە. هەر کە بۆی چنیوون، چووە لە دارستاندا تێر پێتان پێکەنیوە.

ئاگـاداربن بـا لەبەرانـبەر چـاوی پیسـدا؛
خاکەڕاییتـان قەڵغـان بێـت، کە ناپاکـانیش لە
گۆڕێ نەبن، پۆشاک چییە جگە لەتەوقێک بە
ڕۆحتانەوە!
ئەوەیـش لە یـاد مەکەن، کە زەوی چێـژ لە
پێیە ڕووتەکانی ئێـوە وەردەگرێـت و (بـا)یش
پێـی خۆشـە؛ کـاتێکی زیـاتر یـاریی لەگەڵ
پرچتاندا بکات.

لەم کاتەدا بازرگانێک وتی:

"لەبارەی کڕین و فرۆشتنەوە بۆمان بدوێ."

ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی:

زەوی میوەکانی خۆی بە ئێوە دەبەخشێت و ئێوەیش ئەگەر بزانن چۆن دەستەکانتانی لێ پڕ بکەن؛ ئەوا پێویستیان بە هیچی دیکە نابێت و هەر لەم ئاڵوگۆڕەی دیاری و نیعمەتەکانی زەویشە، کە ئێوە ڕەزامەند و ئاسوودە دەبن.

بەڵام ئەگەر ئەم ئاڵوگۆڕە بە خۆشەویستی و دادوەرییەوە نەبێت، ئەوا هەندێکتان بەرەو تەماع و چڵێسی دەبات و هەندێکی ترتان بەرەو نەداریی و برسێتی.

کاتێک ئێوەی ڕەنجدەرانی دەریا و ڕەز و کێڵگەکان، لە بازاڕدا لەگەڵ گۆزەگەر و جۆڵا و عەتاردا کۆ دەبنەوە، ئەوکاتە لە ڕۆحی زەوی بپاڕێنەوە تا بێت، کاڵاکانتان بە

دەستەکانی بکێشێت و تەرازووەکانتان

یەکسان و بەهاکانتان پیرۆز بکات.

مەهێڵن دەستبەتاڵان، ئەوانەی لەبەرانبەر کاری ئێوەدا تەنها قسە دەفرۆشن، بێنە مامەڵەوە لەگەڵتاندا.

بەم جۆرە کەسانە بڵێن:

"لەگەڵمان وەرن بۆ کێڵگە، یان لەگەڵ برا دەریاوانەکانماندا بڕۆن و تۆڕ هەڵدەنە دەریاوە، چونکە زەوی و دەریا لەم کاتەدا لەگەڵ ئێوەدا دەستکراوە دەبێت، هەر وەک چۆن لەگەڵ ئێمەدا بووە."

هەر کاتێکیش گۆرانیبێژان و سەماکاران و شمشاڵژەنان هاتن بۆ لاتان، لە کاڵاکانیان بکڕن، چونکە ئەمانیش ئەهلی میوە و نەباتن، گەرچی شمەکەکەیان خەونە، بەڵام خۆراکە بۆ ڕۆحتان.

بەرلەوەی بازاڕ بەجێ بهێڵن، بڕوانن کە هیچ کەسێک بە دەستی خاڵی ئەوێ بەجێ ناهێڵێت، چونکە ڕۆحی دڵفراوانی زەوی بەئارامیی لەسەر (با) نانوێت؛ تا خواستی هەمووتان نەهێنێتە دی.

لەم کاتەدا یەکێک لە دادوەرانی شار هەستایە سەر پێ و وتی: "باسی تاوان و سزامان بۆ بکە."

ئەویش وەڵامی دایەوە:

هەرکاتێک ڕۆحت لە بادا سەرگەردان بوو، ئەو کات بێ پشتیوان و تەنیا؛ ئازار بە خۆت و خەڵکی تریش دەگەیەنیت.

بۆ هەڵەکانیشتان دەبێت دەرگای چاکەکاران بکوتن و چاوەڕێ بن، ڕەنگە دەرگاشتان لێ نەکرێتەوە.

خواوەندی تۆ وەک زەریا وایە، هەمیشە بە خاوێنی دەمێنێتەوە و تەنها ڕۆحسووکەکان {ئەوانەی ڕۆحیان بە تاوان بارگران نییە} بەرز دەکاتەوە. خواوەندی تۆ وەک خۆر وایە، نە ڕێگای مشک دەزانێت و نە بەدوای کونی مارەوەیە.

بەلام خواوەندی تۆ لە بوونتدا تەنیا نییە،
بەشێکی تۆ هێشتا مرۆڤە و بەشێکیشت
مرۆڤ نییە، پەیکەری بێشێوەی ئێوە لە
خەودا، لەنێو تەمدا، بەدوای بێداریی خۆیدا
دەگەڕێت.

ئێستاش من لەو مرۆڤە دەدوێم، کە لە تۆ
دایە، چونکە ئەوە نە خواوەندی تۆ و نە ئەو
پەیکەرە بێشێوەیەی ناو تەمە، کە سزا و
تاوان دەناسێت.

زۆر جار گوێم لە ئێو بووە، کاتێک دەربارەی
مرۆڤێک قسە دەکەن، کە هەڵەیەکی کردووە،
وەها قسەی لەسەر دەکەن وەک ئەوەی لە
ئێوە نەبێت و لە جیهانێکی ترەوە هاتبێت.

بەڵام من پێتان دەڵێم؛ ئەولیا و
پیاوچاکانیشتان ناتوانن لەو پلەیە بەرزتر بن،
کە هەر یەکێک لە ئێوە دەتوانێت. کەوایە
تاوانبارانیشتان ناتوانن لەو پلەیە نزمتر بن،
کە ئێوە دەبن.

هەروەک چۆن گەڵایەک لە دارێک زەرد نابێت
مەگەر هەموو بێدەنگیی درەختەکەی لە
خۆیدا هەڵگرتبێت، ئاوهایش کەسێک لە ئێوە
ناتوانێ هەڵەیەک بکات مەگەر ئیرادەی
شاراوەی هەمووتانی تێدا بێت.

ئێوە هەمووتان پێکەوە ڕیزتان بەستووە و بەرەو خواوەندی خۆتان هەنگاو دەنێن. هەم ڕێگا ئێوەیە و هەم ڕێبواریش خۆتانن. ئەو کاتەی لەم ڕێگایەدا یەکێک لە ئێوە ساتمە دەکات و دەکەوێ، ئاگادارییەکە بۆ کەسی دوای خۆی تا نەکەوێ.

بەڵێ، ئاگادارییەکیشە سەبارەت بەو کەسانەی لە پێش ئێوەوە ڕۆشتوون، ئەگەرچی تێپەڕیون و بەخێرایی ڕێگاکەیان بڕیوە، بەڵام نەیانتوانیوە بەردی سەر ئەم ڕێیە لابەن.

شتێک دەڵێم و ڕەنگە لەبەر دڵتان گران بێت: بزانن، کوژراو لە کوشتندا بێتاوان و دزیلێکراو لە دزیدا بێکەموکوڕی نییە. هەروەک چۆن چاکەکاران لە خەراپە و پیاوچاکان لە گوناهە بێبەری نین.

بەڵێ، زۆرێک لە ستەمکاران ستەمیان بینیوە و زۆرێک لە مەحکومان باری تاوانی بێتاوانانیان لە ئەستۆ گرتووە.

ئێوە چۆن دەتوانن داد و بیدادیی، چاکە و خراپ لەیەک جیابکەنەوە؟ لەکاتێکدا ئەمانە لە کەنار یەکتردا لەژێر خۆرەتاودا ڕاوێستاون و وەک تاڵی ڕەش و سپی لە یەکترەوە

تـالاون؟ هەرکـاتێکیش تـالی ڕەش بپچڕێـت، جـۆلای ئەم پـارچەیە تەماشـای تەواوی پـارچەکە دەکـات و لە هەمـان کاتیشدا ئـامێری چنینەکەی پشتگوێ ناخات.

هەرکاتێـک یەکێـک لە ئێـوە هاوسـەرە خیانەتکـارەکەی خـۆی ڕابکێشـێتە دادگـاوە، دەبێـت لە دادوەرییکردنـدا، دڵـی هاوسەرەکەشـی بخـاتە تـای تەرازووی دادوەرییەوە، ئینجا بڕیار بدات.

ئەو کەسـەیش کە دەیەوێـت خیانەتکـار شـەلاقکاریی بکـات، دەبێـت لەپێشدا نیگـایەک لە دەروونـی خیـانەتلێکراو بکـات. {تـا بزانـێ خیـانەتلێکراو دەسـتی هەیە لەوەی خیـانەتی لێ کراوە!}

هەرکـاتێکیش یەکێـک لە ئێـوە دەیەوێـت بەنـاوی دادوەریـیەوە، تەور لە درەختـی خـراپە بـدات، ئاگـادار بێـت پـێش وەشـاندن؛ تەماشـای ڕیشـەکانی درەخـتەکە بکـات تـا بزانێـت، کە ڕەگـی چـاکە و خەراپە، زڕ و بەردار، لەنێـو دڵی خامۆشی زەویدا لە یەکتر ئاڵاون.

ئێــوەیش ئەی دادوەرانـــی ئەم شــارە، کە دەتانەوێـت دادوەریـی بـکەن، حـوکمی ئێـوە چییە دەربـارەی ئەو کەسـەی کە جەستەی پـاکە و ڕۆحـی دزە؟حـوکمی ئێـوە چییـە دەربـارەی بکوژێـک، کە پێشـتر ڕۆحـی خـۆی بەدەستی ئەوانیتر کوژرراوە؟

چ حوکمێــک بەســەر کەسـێکی فێڵــزان و ستەمکاردا دەدەیت، کە خـۆی پێشـتر ستەمی لێکراوە و فریـودراوە؟ بە چ شـێوەیەک سـزای تاوانبارێــک دەدەیــت، کە پەشـیمانییەکەی لە تاوانەکەی گەورەترە؟

مەگەر پەشیمانیی هەمـان ئەو سزایە نییە، کە یاسـا دەیەوێـت بیسـەپێنێت بەسـەر تاوانبـاردا، ئەی کـاری ئێـوە جێبەجێکردنـی ئەم یاسـایە نییە؟

سـەرەڕای ئەمـانەش، هێشـتا ئێـوە نـاتوانن پەشـیمانیی لە دڵــی بێتاوانانــدا بـڕوێنن و لەدڵی تاونبـاراندا هەڵی بکەنن.

ئەو، لەناکــاو و تاریکەشـەودا لە دەرگاکــان دەدات، تــا خەڵکـی بێـدار بکـاتەوە و لەودا خۆیان ببینن.

ئێستا ئێوە چۆن دەتوانن دادوەریی بکەن،
مەگەر ئەوەی کە لە ڕووناکییەکی تەواودا
هەموو کردەوەکانتان ببینێت.
ئەوجا دەزانن، مرۆڤ جەستەیەکی ڕاوێستاوە
لە تاریکولێڵەی بەیان و ڕاکشاوە لە
زەردەوتاریکەی ئێوارەدا.
ئەوەیش بزانن، بەرزترین بەردی دیواری
پەرستگا لە نزمترین بەردی بناغە بەهادارتر
نییە.

لەم کاتەدا پارێزەرێک وتی:

"مامۆستا، لەبارەی یاساوە چی دەڵێی؟"

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ئێوە بە دانانی یاسا دڵخۆشن، بەڵام بە شکاندنی یاسا پتر دڵخۆشن. هەروەک ئەو مندااڵانەی لە کەنار دەریاکاندا بەخۆشەویستییەوە کۆشک لە لم دروست دەکەن و دوایی بە پێکەنینەوە دەیڕووخێنن.

بەڵام کاتێک ئێوە کۆشکی لمین دروست دەکەن، دەریا لمی زیاتر دەهێنێتە کەنارەکانییەوە، کاتێکیش دەیڕووخێنن، دەریا لەگەڵتان پێ دەکەنێت، بەڕاستی دەریا لەگەڵ بێتاوانانددا پێ دەکەنێت.

بەڵام چی بەو کەسانە دەڵێن، کە نە ژیانیان دەریایە و نە یاسای مرۆڤەکان وەک کۆشکی لمین دەبینن؟

کەسانێک کە ژیان بۆ ئەوان، وەک بەردێک وایە و یاساش وەک بەردتاشێک دەبینن و هاوشێوەی ژیانی خۆیان دایدەتاشن؟

ئەی چی دەڵێن سەبارەت بە گۆجێک، کە ڕقی لە سەماکردن دەبێتەوە؟

سەبارەت بەو گایەی نیرەی[1] ملی خۆی خۆش دەوێت و ئاسکی ئازادی دارستان بە وێڵ و سەرلەشێواو دادەنێت؟

سەبارەت بەو مارە پیرەی کە ناتوانێت کاژبخات و مارەکانی تر بەڕووت و بێشەرم دەزانێت؟

سەبارەت بەو کەسانەی پێش هەموو کەسێک خۆیان دەکەن بە ئاهەنگەکاندا لەوێ و تێروپڕ دەخۆن و کە دەشڕۆن دەڵێن: هەموو ئاهەنگێک پێشێلکارییە و هەموو ئاهەنگگێڕێکیش یاساشکێنە؟

چی دەڵێن سەبارەت بەو کەسانەی پشت بە خۆرەتاو وەستاون؟ ئەو کەسانەی تەنها سێبەری خۆیان دەبینن و سێبەرەکانیشیان یاساکانیانن؟ چی بەمانە دەڵێن: کە خۆر

---

[1] - نیرە: سیمکە، نیل، نیلە، نێڵە، هوویە. ئەو کەرەستە لەداردوستکراوەی دەکرێتە شان و ملی گا لە کاتی جووتدا. (و)

بۆیان یەک مانای هەیە، ئەویش تەنها سێبەر دروستکردنە؟ جێبەجێکردنی یاساش بۆیان مانای هیچ ناگەیەنێت، جگە لە دانەوینەوە و شوێنپێهەڵگرتنی سێبەرەکانی خۆیان لەسەر زەوی؟

بەڵام کە تۆ بەرەو خۆر برۆیت، چ سێبەرێک دەتوانێت تۆ بەدیار خۆیەوە ڕاگرێت؟ کە تۆ لەگەڵ بابڕۆیت، چ چارۆکەیەک دەتوانێ ڕێی تۆ ئاراستە بکات؟

ئەگەر خۆتان نیرەی ملی خۆتان بشکێنن، چ یاسایەکی مرۆڤ دەتوانێت کۆتتان بکات؟ لە چ یاسایەک دەترسن، ئەگەر لە سەماکردندا پێ بە زنجیری تەوقی کەسی تردا نەنێن؟

کێ دەتوانێت ئێوە ڕاپێچی دادگا بکات لەسەر ئەوەی جلی بەرتان دادەدڕن؟ بەمەرجێ فرێی نەدەنە سەر ڕێگای خەڵکی تر.

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس؛ ئێوە دەتوانن تەپڵەکان بێدەنگ بکەن و ژێی تارەکان شل بکەنەوە، بەڵام کێ لە ئێوە دەتوانێت بە بوولبوولێک بڵێ مەخوێنە؟

لەم کاتەدا پیاوێکی وتاربێژ وتی:

"دەربارەی ئازادیی قسەمان بۆ بکە."

ئەویش وەڵامی دایەوە:

لە دەروازەی شار و لە کەنار ئاگردانەکانتاندا بینیومن؛ خۆتان بە زەویدا داوە و ئازادیی خۆتان پەرستووە. هەروەک چۆن کۆیلە لەبەردەم سەردارەکەیدا سەر نەویی دەکات، لەکاتێکدا دەزانێت کوشتەی دەستی ئەوە.

بەڵێ لەناو باخی پەرستگا و لەژێر سێبەری قەڵادا، ئازادترین کەسی ئێوەم لە بەرگی ئازادییدا دیوە، کە ئازادیی خۆی وەک تەوقێک لەمل و کەلەپچەیەک لەدەست و پێوەندێک لەپێ کردووە.

بەڕاستی دڵم خوێنی لێ دەتکێ، کە دەبینم ئێوە کاتێک ئازادن، کە ئارەزووی ئازادیی بۆتان دەبێتە تەوق و پێوەندێک و ئیدی وەک ئامانج و خەونێک لەبارەی ئازادییەوە قسە

ناکەن. ئێوە ئەو کاتە ئازاد نین، کە ڕۆژگارتان بێ چاودێریی و و شەوانتان بێ نیگەرانیی بێت. بەڵکوو ئەو کاتە ئازادن، کە ئەم شتانە تەنگتان پێ هەڵچنێ و هێشتا ئێوە ڕووت و ئازاد بتوانن بە سەریدا سەرکەون و تێیپەڕێنن.

بەڵام چۆن دەتوانن لە شەو و ڕۆژی خۆتان زیاتر بڕۆن، ئەگەر ئەو زنجیرە نەپسێنن، کە خۆری بەرەبەیانی هۆشیاریی خۆتانتان پێ کۆت کردووە؟

لەڕاستیدا ئەو شتەی ناوتان لێناوە ئازادیی، خۆی بەهێزترین زنجیرە، ئەگەرچی ئەڵقەکانی لەژێر خۆردا بدرەوشێتەوە و سەرنجتان ڕووەو خۆی کەمەندکێش بکات. مەگەر ئەو شتانەی کە دەتانەوێت لە خۆتانی دووربخەنەوە بۆ ئەوەی ئازاد بن؛ بەشێک نین لە خۆتان؟

ئەگەر ئەمە یاسایەکی نادادوەرانەیە، بەڵام ئەوە خۆتان بەدەستی خۆتان لەسەر نێوچەوانتان نووسیوتانە. ئێوە ناتوانن ئەمە نە بە سووتاندنی کتێبی یاساکان و نە بەشۆردنەوەی تەوێڵی دادوەرەکانتان بسڕنەوە، تەنانەت ئەگەر هەموو ئاوی دەریاشی بۆ بهێنن.

ئەگەر دەتانەوێ تەختی حوکمی ستەمکاریک بڕووخێنن، دەبێ یەکەمجار ئەو تەختە بڕووخێنن، کە لەدەروونتاندا بۆتان دروست کردووە.

ئەگینا چۆن ستەمکارێک دەتوانێت فەرمانڕەوایی کەسانی ئازاد و سەربەرز بکات، ئەگەر ئەو خەڵکە خۆیان، ژێردەستەییەک لە ئازادییەکەیان و ملشۆڕییەک لە سەربەرزییەکەیاندا نەبێت؟

ئەگەر نیگەرانی لێی، ئەوە خۆتان هەڵتانبژاردووە و ئەو خۆی نەسەپاندووە.

ئەگەر ترسێکتان هەیە و دەتانەوێت لەدڵتاندا دەریپەڕێنن، ئەو ترسە لە دڵی ئێوەدایە، نەک لە دەستی ئەو کەسەدا، کە لێی دەترسن.

لەڕاستیدا هەموو شتەکان لە دەروونتاندا دەستیان لە ملی یەک کردووە، ئەوەی دەتانەوێت و ئەوەی لێی دەترسن، ئەوەی لەگەڵی کۆک و ئەوەی لەگەڵی ناکۆکن، ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێن و ئەوەی لێی هەڵدێن.

ئەم شتانە لە دەروونتاندا دەجوولێن و وەک ڕووناکی و سێبەر کە پێکەوەن، کاتێ سێبەر نامێنێت، ڕووناکی جێماو دەبێت بە سێبەر بۆ ڕووناکییەکی تر.

بەم شێوەیە کاتێک ئازادیی ئێوە زنجیری خۆی دەپسێنێت، ئەڵقەکانی دەبێت بە ئازادییەکی گەورەتر لە زنجیر و پێوەندتان دەکات.

لەم کاتەدا ژنە قەشەکە جارێکی تر هاتەوەگۆ و وتی: "دەربارەی عەقڵ و سۆز بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

زۆرجار ڕۆحی ئێوە دەبێتە گۆڕەپانی جەنگێک، تێیدا عەقڵ و دادوەریتان لەگەڵ هەست و ئارەزووتان ڕووبەڕووی یەک دەبنەوە.

خۆزگە توانیبام ئاشتیبەخشی ڕۆحتان بم و ئەو سەنگەر لەیەک گرتنەی بەشەکانی ڕۆحتان بگۆڕم بە یەکڕیزیی و هاوئاهەنگیی.

بەڵام چۆن دەتوانم ئەوە بکەم، مەگەر ئەوەی خۆشتان ئاشتیخوازبن و هەموو پێکهاتەکانی ڕۆحی خۆتان خۆش بوێت.

عەقڵ و سۆزی ئێوە؛ چارۆکە و سوکانی کەشتیی ڕۆحی ئێوەیە.

هەرکاتێکیش ئەم کەشتییە چارۆکەکەی درا یان سوکانەکەی شکا، ئێوە لێرە و لەوێ سەرگەردان دەبن، یان لە نێوەڕاستی دەریادا گیردەخۆن.

چونکە ئەگەر بەتەنها عەقڵ فەرمانڕەواییتان بکات، دەبێتە ڕێگر و سنووردانان دەکات، ئەگەر بەتەنها سۆزیش فەرمانڕەوایەتیتان بکات، ئەوە دەبێتە ئاگرێک، کە خۆیشی دەسووتێنێت.

کەواتە لە ڕۆحتان بگەڕێن، با تێیدا عەقڵ بە بەرزاییەکانی سۆزدا هەڵزنێ و بۆی ببێتە سترانبێژ.

هەروەها لێگەڕێن؛ سۆزتان عەقڵتان ئاراستە بکات، بەم شێوەیە سۆزتان لە مردنی خۆیدا دەژێتەوە، وەک چۆن قەقنەس لە خۆڵەمێشی خۆیدا دروست دەبێتەوە.

من دەمەوێت؛ وەک دوو میوانی خۆشەویستی ماڵەکانتان لەگەڵ عەقڵ و سۆزتاندا ڕەفتار بکەن. بێگومان دەبێ هەردوو میوانەکە بەیەک ئەندازە ڕێزیان لێ بگیرێت، چونکە هەرکەس گرنگیی زیاتر بداتە یەکێکیان، ئەوا خۆشەویستیی هەردووکیان لەدەست دەدات.

کاتێک لەنێوان ئەم تەپۆلکانەدا، لەژێر سێبەری فێنکی چنارێکدا دادەنیشن و لە بێدەنگیی کێڵگە و مێرگە دوورەکاندا مەست دەبن، ئەو کاتە بهێڵن؛ دڵتان بە بێدەنگیی بڵێت: (خواوەند لە عەقڵدا پشوو دەدات).

کاتێکیش تۆفان هەڵدەکات و ڕەشەبای بەهێز، درەختی دارستانەکان ڕادەوەشێنێت و هەورەگرمە و برووسکە، شکۆی ئاسمان ڕادەگەیەنێت، ئەو کات لە دڵی خۆتاندا بەترسەوە بڵێن: (خواوەند لە سۆزدا دەجمێ).

لەبەرئەوەی ئێوەش هەناسەیەکن لە گەردوون و گەڵایەکن لە دارستانی خوداوەند، دەبێ لە عەقڵدا پشوو بدەن و لە سۆزدا بجمێن.

لەم کاتەدا ژنێک هەستایە سەرپێ و وتی:
"دەربارەی ئازار بۆمان بدوێ."
ئەویش لە وەڵامدا وتی:
ئازارەکانتان شکاندنی توێکڵێکە، کە تێگەیشتنتانی لەخۆگرتووە. هەروەک چۆن دەبێ توێکڵی میوەکان شەق ببات، تا ناوکەکەی خۆر ببینێت، ئێوەیش ئاوها دەبێت ئاشنای ئازار بن.
ئەگەر ئێوەیش بتوانن دڵتان بە سەرسامیی پەرجوەکانی ژیانی ڕۆژانەتان ڕابهێنن، ئەوە ئازارەکانتان کەمتر لە خۆشییەکانتان سەرتان دەسوورمێنێت و ئیدی وەرزەکانی دڵی خۆتان قبووڵ دەکرد، هەروەک چۆن تێپەڕینی وەرزەکانتان بەسەر کێڵگەکانتاندا قبووڵ کردووە.
ئەوکاتە ئیدی بە ئارامییەوە دەڕواننە زستانگەلی خەمەکانتان، چونکە زۆر لە

ئازارەکانتان؛ ئێوە خۆتان هەڵتانبژاردووە.
ئازار ئەو دەرمانە تاڵەیە، کە پزیشکی دەروونتان، برینەکانتانی پێ سارێژ دەکات.
کەواتە متمانە بەو پزیشکە بکەن و دەرمانەکانی بە ئارامی و دان بەخۆداگرتنەوە بنۆشن.
چونکە دەستی ئەو، ئەگەرچی ڕەق و سەنگینە، بەڵام لەلایەن دەستی میهرەبانی غەیبەوە ڕێنمایی دەکرێت.
ئەو جامەی کە دەتانداتێ، ئەگەرچی لێوەکانتان داخ دەکات، بەڵام لە گڵێک دروست کراوە، گۆزەگەرەکەی بە فرمێسکی پیرۆزی خۆیەوە قوڕەکەی شێلاوە.

لەم کاتەدا پیاوێک وتی:

"دەربارەی خۆناسین بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

دڵەکانتان لە بێدەنگییدا، نهێنیی شەو و ڕۆژ تێ دەگات، بەڵام گوێکانتان تینووی بیستنی دەنگی دڵتانن. ئێوە لە وشەکانەوە دەتوانن ئەوە بزانن، کە لە ئەندێشەدایە، دەتوانن بە سەری پەنجەکانتان دەست لە جەستەی ڕووتی خەونەکانتان بدەن، چی لەوە باشترە، کە دەتوانن وا بکەن.

پێویستە کانیی شاراوەی ڕۆحتان هەڵقوڵێ و ڕووە و دەریا هاژە بکات، ئەوکاتە گەنجینەی قووڵی بێسنووری ڕۆحی خۆتان بە چاو دەبینن.

بەڵام بۆ کێشانەی گەوهەرە نەناسراوەکانی ئەم گەنجینەیە، تەرازوو دروست مەکەن و قووڵایی دانایی خۆتان بە پەت و گوریس

مەپێـون، چـونکە (خـود) دەریـایەکی بێکۆتـاو بێبنە، کە ناپێورێت.

مەڵێن: (ڕاســتیمان دۆزیــیەوە)، بەڵکــو بڵــێن: (ڕاســتییەکمان دۆزیــیەوە). مەڵــێن: (ڕێـڕەوی ڕۆحمـان دۆزیـوەتەوە)، بەڵکـوو بڵـێن: (ڕۆحـم بینـی بە ڕێـڕەوی منـدا دەڕۆشـت)، چونکە ڕۆح بە هەموو ڕێڕەوەکاندا دەڕوات.

ڕۆح نە لەســەر هێڵێـک ڕێ دەکـات و نە وەک قــامیش بە ســتوونیی دەڕوێــت، ڕۆح وەک گوڵەشــلێری ئــاویی دەپشــکوێ، کــە پەڕەی بێشوماری لە هەژمار نایە.

لەم کاتەدا مامۆستایەک وتی:

"دەربارەی فێرکردن بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

کەس ناتوانێت هیچ شتێکتان بۆ ئاشکرا بکات مەگەر ئەوەی کە لە بەرەبەیانی زانینی خۆتاندا نیوەخەوتوو بێت.

مامۆستایەک، کە لەژێر سێبەری پەرستگادا و بەنێو خوێندکارەکانیدا هەنگاو دەنێت، جگە لە بیروباوەڕ و خۆشەویستییەکەی، هیچ زانستێک بەوان نابەخشێت.

ئەگەر مامۆستاکەتان بەڕاستیی زانا بێت، میوانداریتان ناکات بۆ خانەی حیکمەتی خۆی، بەڵکوو ڕێنماییتان دەکات ڕووەو ماڵی هۆشی خۆتان.

ڕەنگە ئەستێرەناسێک بتوانێت لەبارەی تێگەشتنی خۆی بۆ ئاسمان، قسەتان بۆ بکات، بەڵام ناتوانێت تێگەشتنی خۆیتان

بداتێ. ڕەنگە مۆسیقکارێک بتوانێت لەسەر هەموو ئەو ڕیتمانەی لە گەردووندا هەیە مۆسیقاتان بۆ بژەنێت، بەڵام نە دەتوانێت گوێیەکانی خۆیتان بداتێ نە دەنگێک، کە زایەڵە دەکات.

ڕەنگە ئەو کەسەی سەروکاری لەگەڵ ماتماتیکدا هەیە، بتوانێ لەبارەی جیهانی کێش و ئەندازەوە بۆتان بدوێ، بەڵام ناتوانێ بۆ ئەو دەربارەتان بەرێت.

چونکە هیچ کەسێک ناتوانێ پەڕوباڵی خەونی خۆی بە کەسێکی تر ببەخشێت. تەنانەت هەریەک لە ئێوە بەرانبەر زانستی خوداوەند تەنیابالن و پێویستیشە یەک بەیەکتان لە تێگەیشتنی خوداوەند و درکی زەویدا تەنیابن.

لەم کاتەدا گەنجێک وتی دەربارەی:

"هاورێیەتی بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

هاورێکەت وەڵامی خواستەکانی تۆیە. کێڵگەیەکە، کە بەخۆشەویستییەوە تۆوی تێدا دەچێنیت و بەسوپاسەوە بەرهەمەکەی دەچنیتەوە. ئەو سفرەوخوانەیە، کە بەبرسێتییەوە هانای بۆ دەبەیت و ئارامیی تێدا دەدۆزیتەوە.

کاتێک هاورێکانتان لەبارەی ئەندێشەی خۆیانەوە قسەتان بۆ دەکەن، لە (بەڵێ) و (نەخێر)ی ناختان مەترسن و بیڵێن.

کاتێکیش بێدەنگ دەبێت، دڵتان گوێبیستی دڵییەتی، چونکە لە دۆستایەتییدا هەموو خواست و ئەندێشەکان بەبێدەنگیی لەدایک دەبن.

کاتێـــک هـــاوڕێکەت بەجێتـــدەهێڵێت دڵگــران مەبە، چـــونکە ئەو شـــتەی تـــۆ لە ئەودا لە هەر شـتێکی تـــر خۆشــترت دەوێــت، زۆرجـــار لە بـێ ئەوییـــدا ڕوونتـــر دەیبینیـــت. هەروەک چـــۆن شـــاخەوانەکان، شـــاخەکان لە دوورەوە جـــوانتر دەبینن.

ئاگـــادار بـــن لە دۆســـتایەتییدا هـــیچ مەبەســـتێکتان نەبێـــت، جـــگە لە قـــووڵکردنەوەی ڕۆحـــی هـــاوڕێیەتی، چـــونکە ئەو خۆشویســـتنەی هەڵـــوەدای پەیبـــردن بە ڕازەکـــانی خـــۆی نەبێـــت، خۆشەویســـتی نیـــیە و تەنهـــا تـــۆڕێکە، کە فـــڕێ دەدرێ و شتۆچکەی بێفەڕ دەگرێت.

باشـــترینی خۆتـــان بە هاوڕێکانتـــان ببەخشـــن و ئەگەر داکشـــــانەکانتان دەبینێـــــت، بـــــا هەڵکشانەکانیشتان ببینێت.

ئەوە چ هـــاوڕێیەتییەکە، کە بـــۆ کـــات کوشـــتن بێـــت! لەگەڵ هاوڕێکانتانـــــدا بەدوای کاتـــــدا بگەڕێـــن تـــا تیـــای بـــژین، چـــونکە هاوڕێکانتـــان خواســـــتەکانتان پـــــڕ دەکەن، نەک بەتاڵتـــــان بکەنەوە.

لە شـــیرینیی هاوڕێیەتییـــدا پێکەنـــین و چێـــژ بەش بـــکەن، چـــونکە لە شـــەونمی شـــتگەلە وردەکاندا کازیوەی دڵ دەبووژێتەوە.

لەم کاتەدا وێژەرێک هاتەگۆ و وتی:
"دەربارەی قسەکردن بۆمان بدوێ."
ئەویش لە وەڵامدا وتی:
ئێوە کاتێک دەکەونە قسەکردن، کە لەگەڵ ئەندێشەتان کۆک و تەبا نەبن. ئێوە کاتێک ناتوانن چیتر لە تەنیایی دڵتاندا نیشتەجێ بن، دێن و لە لێوەکانتاندا دەژین، چونکە دەنگ کاتبەسەربردنێکی خۆشە بۆتان.
ئێوە لە زۆربەی قسەکانتاندا ئەندێشەکانتان نیوەمردوو دەکەن، چونکە ئەندێشە باڵندەیەکی ئاسمانییە، کە ڕەنگە لە قەفەسی وتندا باڵەکانی بکاتەوە، بەڵام ناتونێت بفڕێت.
لەنێو ئێوەدا کەسانێک هەن لە ترسی تەنیایی پەنا دەبەنە بەر زۆروتن، چونکە بێدەنگیی پەردە لەسەر تەنیاییەکەیان هەڵدەماڵێت و ئەوانیش لەمە هەڵدێن.

لەنێو ئێوەدا کەسانێک هەن، لەخۆیانەوە قسە دەکەن، کەچی ڕاستییەک لە دەمیان دێتە دەرەوە، کە خۆشیان تێی ناگەن.

کەسانێکیش هەن، ڕاستییەک لە دەروونیاندایە، بەڵام بە وشە دەری نابڕن، لە سینەی ئەم جۆرە کەسانەدا ڕۆح لە بێدەنگیی هاوئاهەنگیی خۆیدا نووستووە.

کاتێکیش لە سەرەڕێ یان لە چەقی بازاڕدا ڕووبەڕووی هاوڕێکانتان دەبنەوە، بهێڵن ڕۆحتان لێوەکانتان بخاتە جووڵە و بدوێ. ڕێگە بدەن دەنگێک، کە لە دەنگی ئێوەدا بۆ گوێیەک، کە لە گوێی ئەودایە، بدوێ.

چونکە ڕۆحی ئەو حەقیقەتی دڵی تۆی وەک تامی شەرابێک لە زاردا دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا نە شەراب ماوە و نە جام.

لەم کـاتەدا ئەستێرەناسـێک پرسـی: "مامۆسـتا،
ئەی لەبارەی کاتەوە چی دەڵێیت؟"
ئەویش لە وەڵامدا وتی:
ئێــوە دەتانەوێــت کــات بپێــون، دەتانەوێــت
ڕەفتــار و تەنــانەت ڕۆحیشــتان بەگــوێرەی
کــاتژمێر و وەرزەکــان ڕێــک بــخەن، لەکاتێکـدا
کات ناکۆتا و نەپێوراوە.
ئێوە لە کـات چەمێـک دروسـت دەکەن، ئەوجـا
دادەنیشـن و بەدیـار ڕۆیشـتنییەوە ڕادەمێـنن،
بەڵام ئەو نەمـــرە و هۆشـــیارە بەنەمریـــی
خۆیشـی. کـات دەزانێـت، دوێنـێ یادگـاریی و
سبەینێش خەونی ئەمڕۆیە.
کـات لەنێـو ئێـوەدا سـتران دەچڕێـت و بیـر
دەکـــاتەوە، هێشـــتا لە بـــازنەی هەمـــان ئەو
ساتەدایە، کە ئەستێرەکانی بەئاسماندا پژاند.
کێ لە ئێـوەدا هەسـت بەوە ناکـات، کە توانـای
خۆشەویستی تێیدا لە ڕادەبەدەرە؟

کێ لە ئێوە هەست بەوە ناکات، ئەم خۆشەویستییە لە ڕادەبەدەرەی، لە تەوەری بوونیدا گەمارۆدراوە و نابزوێ و لە خۆشەویستییەکەوە ناچێتە سەر ئەندێشەی و شێوازێکی تری خۆشەویستی؟

کاتیش وەک خۆشەویستی وایە، بێ شوێنە و بەش بەش ناکرێت، بەڵام ئەگەر بیرتان لەوە کردەوە، کات دابەش بکەن بۆ سەر وەرز، با لەهەر وەرزێکدا هەموو وەرزەکانی تریش هەبن.

بهێڵن ئەمرۆ ڕابردووتان لە باوەش و داهاتووتان بەتاسەوە لەئامێز بگرێت.

لەم کاتەدا یەکێک لە بەتەمەنەکانی شار وتی: "لەبارەی چاکە و خراپەوە بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

تەنها دەتوانم باس لە چاکەکانتان بکەم، نەک خراپەکانتان، چونکە خراپە چییە، جگە لە چاکەیەک، کە بەدەست تینوویەتی و برسییەتی خۆیەوە ئازار دەچێژێت؟

لەڕاستیدا چاکە کاتێک برسی بێت لە ئەشکەوتە تاریکەکانیشدا بەدوای خۆراکی خۆیدا دەگەڕێت، کاتێکیش تینووی بێت لە ئەستێڵەکانیش ئاو دەخواتەوە.

هەرکاتێک ئێوە لەگەڵ خۆتاندابن؛ چاکن، خۆ ئەگەر لەگەڵ خۆشتاندا نەبن؛ خراپ نین، چونکە ماڵێکی ڕووخاو، مەرج نییە لانەی دزان بێت، ماڵێکی ڕووخاو تەنها ماڵێکی ڕووخاوە.

کەشتیی بێ سوکان؛ لەوانەیە بێ ئاسۆ بەنێو دوورگە مەرگبارەکاندا سەرگەردان بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نوقمی دەریا نابێت.

ئێوە ئەوکاتە چاکن، کە لە خودی خۆتان ببەخشن و هەرکاتێکیش بۆ خودی خۆتان {سوود} وەربگرن خراپ نین، چونکە ئەوکاتانەی بەدوای {سوودی} خۆتاندا دەگەڕێن وەک ئەو ڕەگە وەهان، کە باوەش بەخاکدا دەکات و لە سنگی زەوی دەمژێت.

بێگومان میوە ناتوانێت بە ڕەگەکەی بڵێت: (وەک من پێ بگە و پڕبە و هەمیشە لە بەرهەمی خۆت ببەخشە.) بۆ میوە بەخشین پێویستە، هەروەک چۆن بۆ ڕەگ وەرگرتن پێویستە.

ئێوە ئەو کاتە چاکن، کە بەتەواویی لە گوفتارەکانتان بەئاگان، بەڵام ئەو کاتەیش خراپ نین، کە نووستوون و بەدەم خەوەوە وڕێنە دەکەن؛ چونکە لەوانەیە وڕێنە زمانێکی لاواز، بەهێز بکات. ئێوە ئەو کاتە چاکن، کە بە لێهاتوویی تەواو و هەنگاوی جێگیرەوە بەرەو مەبەستی خۆتان دەکەونە ڕێ.

بەلام کــاتێکیش بــۆ مەنزلـــی مەبەســتتان شەلەشــەل بــڕۆن هەر خــراپ نــین، چــونکە ئەوانەی شەلەشەلیش دەڕۆن هەر دەجوولێن.

بەڵام ئەی ئەوانەی لەم ڕێگــــایەدا تیـــژڕەون؛ لەبەرچــاوی شــەلەکاندا مەلەنگــێن و وابــزانن بەمە میهرەبانییــان پێشــکەش دەکەن! ئێــوە بە هەزار شێوە چــاکن و کــاتێکش بــاش نــین؛ خــراپ نــین، تەنهـــا ئەوەیە وێـــل و تەمەڵـــن. حەیـــف! کە ئاســکەکان نــاتوانن کیســەڵەکان فێــری ڕاکــردن بکەن.

چــاکیی ئێــوە لە خواســتێکدایە بــۆ گەیشــتن بە مەزنیـــی خـــود و ئەم خواســـتەش لە هەمووتانـــدا شــتێکی سرووشــتییە، بەڵام لە لای هەنــدێکتان خواســت، ڕووبــارێکی بەخــوورە، کە ڕووەو دەریـــا دەخرۆشـــێت و نهێنیـــی کۆســـاران و ئـــاوازی دارستانەکان لەگەڵ خۆیاندا دەبات.

لەلای هەنــدێکی تریشــتان خواســت، جــۆگەیەکی هێمــنە، کە لەملاولاکانــدا ون دەبێــت و ناگــاتە کەنــار، بەڵام بــا ئەوانەتــان کە تیــژڕەون بەوانــی تــر نەڵــێن: "ئەوە بــۆ خاوەخــاوە دەڕۆن؟" چــونکە چــاکەکەرانی ڕاســتەقینە، هـــیچ کاتێــک بە بــێ بەرگەکــان نــاڵێن: (کوا جلەکەتــان؟) و بە بــێ ماڵەکان ناڵێن: (کوا ماڵتان؟)

لەم کاتەدا ژنەقەشەیەک وتی:

"دەربارەی نزا بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ئێوە کاتێک لە ناڕەحەتییدا بن، یان پێویستیتان بە شتێک بێت، نزا دەکەن. خۆزگە لەکاتێکیشدا بێ کێشەن و تەژین لە شادیی، نزاتان بکردایە، چونکە نزا چییە جگە لە کشانت بە بۆتەی گەردووندا؟

ئەگەر ئاسوودە دەبن کاتێک تاریکیی نێو ناختان دەڕژێتە ئاسمانەوە، بەهەمان شێوەیش دڵخۆش بن، کاتێک کازیوەی دڵتان {ڕووناکیتان} دەڕژێتە ئاسمانەوە.

کاتێک ڕۆحتان بۆ نزا بانگهێشتان دەکات و ئێوە دەست دەکەن بە گریان، لێگەڕێن با جار لەدوای جار بتانگرێنێت تا لەکۆتاییدا دەتانخاتە پێکەنین.

لەو کاتەدا نزا دەکەن، ڕۆحتان بۆ ئاسمان هەڵدەکشێ و ئەو کەسانە دەبینێت، کە لەهەمان ئەو ساتەدا نزا دەکەن، لەم کاتە بترازێ هیچ کاتێکی تر ناتوانن ڕۆحی ئەوانی تر ببینن.

کەواتە بهێڵن سەردانتان بۆ ئەم پەرستگا نادیارە، شیرین و پڕ لە دۆستایەتیی بێت، چونکە لەمە بترازێت، ئەگەر هەر مەبەستێکی ترتان لەم سەردانە هەبێت، ئەوە هیچ بەدەست ناهێنن. ئەگەر تەنها بۆ خۆتان و تەنانەت بۆ نیازی خەڵکی تر بپاڕێنەوە، گوێتان لێ ناگیرێت.

تەنها ئەوە بەسە ڕوو لەم پەرستگا نادیارە بکەن. من ناتوانم ئێوە فێر بکەم، چۆن بە وشە نزا بکەن، خواوەند گوێ لە وشە ناگرێت، لەکاتێکدا خۆی خستوویەتییە سەر لێوتان.

هەروەها نایشتوانم فێری نزای دەریا و دارستان و چیاکانتان بکەم، بەڵام ئێوە ئەی ئەوانەی لەنێو دەریا و دارستان و چیاکاندا لەدایکبوون، خۆتان دەتوانن نزاکانی ئەوان لەدڵتاندا بدۆزنەوە.

ئەگەر لە خامۆشیی شەودا گوێ هەڵبخەن،
گوێتان لێ دەبێ، ئەوان بەبێدەنگیی دەڵێن:
(خوادەوەند، کە تۆ باڵت بە ئێمە داوە؛
ئەوەی لە ئێمەدا دەفڕێ هەر هی تۆیە، ئەوە
ئارەزووی تۆیە لەئێمەدا شەوانمان کە شەوی
تۆن، دەکات بە ڕۆژانمان کە ڕۆژی تۆن.
ئێمە ناتوانین پرسیاری هیچت لێ بکەین،
چونکە تۆ هەموو شتێکمان دەزانی بەر
لەوەی لەدایک ببین. تۆ خۆت خواستی
ئێمەی تا زیاتر لە خۆتمان پێ ببەخشی،
زیاترت پێ داوین.)

لەم کـاتەدا زاهیـدێک {خەڵوەتکێشـێک}، کە ساڵی جارێـک دەهـاتە شار، هـاتە پێشـەوە و وتی: "دەربارەی چێژ بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

چێـژ گـۆرانیی ئـازادییە، بەڵام خـودی ئـازادیی نییە. چرۆی خواسـتی ئێـوەیە، بەڵام میـوەکەی نییە. قـووڵاییەکە بەرزایـی بانـگ دەکـات، بەڵام خـۆی، نە قـووڵاییە و نە بەرزیـیە. دیلـی نێـو قەفەسـێکە و بـاڵەفڕکێیەتی، بەڵام ئاسـمانێک نییە لەخۆی بگرێت.

بەڵێ، بەڕاستیی چێژ گۆرانیی ئازادییە.

هیـوادارم لە کانگـای دڵتـانەوە ئەم گـۆرانییە بڵـێن، بەڵام نامەوێـت لەکـاتی وتنیـدا، دڵـی خۆتان بدۆڕێنن.

هەنـدێک لە گەنجەکانتـان بەشـێوەیەک دوای چێژەکـان دەکەون، وەک بڵێـی ئەوە هەمـوو شتێک بێـت، ئێـوەش لەسـەر ئەوە سەرزەنشت

و ئاواتبارییان دەکەن. من نە سەرزەنشتیان دەکەم و نە ئاواتبار، بەڵکوو هانیان دەدەم هەمیشە بگەڕێن.

چونکە چێژی خۆیان دەدۆزنەوە، بەڵام بەتەنیا نا، چونکە چێژ حەوت خوشکی هەیە، بچووکترینیان لە خۆی جوانترە. ئەی حیکایەتی ئەو پیاوەتان نەبیستووە، کە عەرد بۆ ڕەگی دار هەڵدەکەنێت و گەنجینەی تیا دەدۆزێتەوە؟

هەندێک لە بەتەمەنەکانتان بە پەشیمانییەوە یادی چێژەکانیان دەکەن؛ وەک ئەوەی لەمەستییدا هەڵەیەکیان کردبێت، بەڵام پەشیمانیی ئەندێشە تاریک دەکات، نەک تەمێ.

ئەوان دەبێت بەسوپاسەوە چێژەکانیان بەبیر بهێننەوە، هەروەک چۆن خەرمانی هەڵگرتنی هاوینانیان بیر دەهێننەوە، بەڵام ئەگەر پەشیمانیی ئاسوودەیان دەکات، لێگەڕێن با ئاسوودەبن.

لەنێو ئێوەدا کەسانێک هەن، نە ئەوەندە گەنجن بە دوای چێژدا بگەڕێن و نە ئەوەندەیش پیرن یادی بکەنەوە، لە ترسی گەڕان و بەبیرهێنانەوە لەهەر جۆرە چێژێک

هەڵدێن، نەوەک ڕۆحیان فەرامۆش بکەن، یان بیرەنجێنن، بەڵام چێژی ئەوان خۆدوورگرتنە لە چێژ. کەواتە ئەمانیش گەنجینەی خۆیان دەدۆزنەوە، گەرچی بە لەرزەوە بەدوای ڕەگدا دەگەڕێن.
پێم بڵێن کێ دەتوانێت ڕۆح برەنجێنێت؟ ئایا بوولبوول، بێدەنگیی دەشێوێنێت؟ گوڵەئەستێرە، ئەستێرە بێزار دەکات؟ دووکەڵی بڵێسەی ئاگری ئێوە، قورسایی دەخاتە سەرشانی (با)؟
ئێوە وادەزانن ڕۆح گۆمێکی مەنگە، دەتوانن بە دارێک ئەو ئارامییەی بشێوێنن؟
زۆرجار ڕوودەدات، کە چێژێک ڕەت دەکەنەوە، بەڵام لە گۆشەیەکی بوونی خۆتاندا ئەم چێژە هەر هەڵدەگرن. کێ دەزانێت ئەوەی ئەمڕۆ ڕەتی دەکەنەوە سبەی حەزتان لێی نابێت؟
تەنانەت جەستەشتان خاوەنداریێتیی خود و پێویستەکانی خۆی دەزانێت و هیچ فریو ناخوات. جەستەی ئێوە سازی ڕۆحی ئێوەیە، بەدەست خۆتانە بەم سازە ئاوازی خۆش یان ناخۆشی پێ بژەنن.

ئێستا لە دڵی خۆتاندا دەپرسن:

(چۆن لە چێژدا چاکە و خراپە جیابکەینەوە؟)

بچنە نێو کێڵگە و باخەکانتان، تا فێر ببن؛ چێژی هەنگ لەوەدایە، کە شیلەی گوڵەکان بمژێ و چێژی گوڵیش لەوەدایە شیلەی خۆی ببەخشێت بە هەنگ.

چونکە بۆ هەنگ، گوڵ سەرچاوەی ژیانە و بۆ گوڵ، هەنگ پەیامبەری خۆشەویستییە، بۆ هەردووکیشیان، بەخشین و وەرگرتنی چێژ، پێویستی و ئۆخژنە.

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس لە چێژدا وەک گوڵ و هەنگ بن.

لەم کاتەدا شاعیرێک هاتەگۆ و وتی:

"دەربارەی جوانی بۆمان بدوێ."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

چۆن دەتوان لەو شوێنەی بەدوای جوانیدا دەگەڕێن بیدۆزنەوە، مەگەر هەر خۆی ڕێگا و ڕێبەریشتان بێت. چۆن لە جوانیی دەدوێن، مەگەر خۆی وشەچنتان بێت.

زامدار و ئازاردیدەکان دەڵێن: "جوانی میهرەبان و نەرمونیانە، وەک دایکێکی گەنجی شەرمنی بەشکۆ، بەنێوماندا هەنگاو دەنێت".

عاشقەکان دەڵێن: "نا، جوانی بەهێز و ترسێنەرە، وەک ئەو تۆفانەی زەوی ژێر پێ و ئاسمانی سەر سەرمان دەهەژێنێت".

شەکەت و ماندووەکان دەڵێن: "جوانی چپەیەکی نەرمە و لەگەڵ ڕۆحمان دەدوێت، دەنگی ئەو بۆ بێدەنگیمان وەک تیریژی

ڕووناکیی کز وەهایە لەبەر سێبەرێکدا
بلەرزێت."
بێئۆقرەکان دەڵێن: "دەنگی هاوارەکانی
جوانیمان لە چیاکاندا بیستووە، لەگەڵ
هاوارەکانیدا تەقەی سمی ئەسپ و شەقەی
باڵ و نەڕەی شێر دەبیسترا."
پاسەوانانی شەوانی شار دەڵێن: "جوانی
لەگەڵ کازیوەدا لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ."
لە نیوەڕۆیاندا کرێکاران و ڕێبواران دەڵێن:
"ئێمە ئەومان بینیوە لە پەنجەرەی
خۆرئاوابوونەوە خۆی بەسەر زەویدا
شۆڕکردۆتەوە."
لە زستاناندا ڕێبەستراوانی نێو بەفر دەڵێن:
"جوانی لەگەڵ بەهاردا دێت و بەسەر
گردەکاندا بازبازێن دەکات."
لە گەرمای هاوینیشدا وەرزێرەکان دەڵێن:
"جوانیمان بینیووە لەگەڵ گەڵای پایزدا
سەمای کردووە و بەفر بەقژییەوە بووە."
ئێوە ئەو هەموو شتەتان دەربارەی جوانی
وتووە، بەڵام لەڕاستیدا دەربارەی جوانی
نەدواون، بەڵکوو باسی خواستە بەدی
نەهاتووەکانتان کردووە و جوانیش خواست و
پێویستی نییە، بەڵکوو شادییەکی بێخەوشە.

جوانی، نە لێوێکی تینووە و نە دەستێکی خاڵیی و درێژکراوە. جوانی، دڵێکی داگیرساو و ڕۆحێکی جادووگەرە.

جوانی، وێنەیەک نییە لێی بڕوانیت و ئاوازێک نییە گوێی لێ بگریت. جوانی، تابلۆیەکە بەچاوی بەستراویشەوە دەتوانیت بیبینیت و گۆرانییەکە بە گوێی گیراویشەوە دەتوانی بیبیستیت.

جوانی، نە شیلەی ژێر توێکڵی دارە و نە باڵی چنگاوییە. جوانی، باخێکی هەمیشە بەهارە و پۆلێ فریشتە بەردەوام بەسەریدا دەفڕن.

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس، جوانی ژیانە، کاتێک ڕووپۆشی پیرۆزی خۆت لادەدات. بەڵام ئێوە ژیانن و ڕووپۆشیش هەر خۆتانە. جوانی، ڕامانی ناکۆتایە لەبەر ئاوێنەدا لە خۆی، بەڵام ناکۆتا ئێوەن و ئاوێنەیش هەر خۆتانن.

لەم کاتەدا قەشەیەکی پیر وتی:

"لەبارەی ئاینەوە قسەمان بۆ بکە."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

بۆ ئەمڕۆ بێجگە لەوە باسی هیچی ترم کردووە؟ ئایا هەموو ئەندێشە و کاردانەوەیەک ئاین نییە؟ ئەی شت هەیە نە ئەندێشەی بێت و نە کاردانەوە؟

ئاین، سەرسامییەکە بەردەوام ڕۆح دەکۆڵێت، تەنانەت ئەو ساتانەیش، کە دەستەکان بەردێک دەتاشن یان تەون دەکەن.

کێ دەتوانێت باوەڕی لە کردارەکانی جیا بکاتەوە، یان بۆچوونەکانی لە پیشەکەی؟ کێ دەتوانێت کاتەکانی لێک هەڵوێرێ و بڵێت:"ئەمە بۆ خودا و ئەمەیش بۆ خۆم، ئەمەیان بۆ ڕۆحم و ئەمەیشیان بۆ جەستەم؟"

هەموو کاتەکانتان؛ باڵکەلێکن لە ئاسماندا لە خودەوە بۆ خود لەشەقەی باڵ دەدەن. ئەو کەسەی ئاکاری وەک بە بەرگێکی بەنرخ لەبەر کردووە، چاکتر وایە ڕووت بێت، {با نەترسێت} خۆ خۆر و با پێستی کون ناکەن.

ئەو کەسەیش ڕەفتاری بەپێی یاسای ڕەوشت سنووربەند دەکات، ئەوا باڵندەی غەزەلخوێنی خۆی لە قەفەسدا دیل دەکات. کوا دەنگی گۆرانییە ئازادەکانیش لە پشت میلەی قەفەس و تەلبەنەکانەوە بەرز دەبنەوە؟

ئەو کەسەیش کە پەرستن وەک پەنجەرەیەک بکاتەوە و دابخات، هێشتا ماڵی ڕۆحی خۆی نەدۆزیوەتەوە، کە پانتایی پەنجەرەکانی لە کازیوەوە تا کازیوەن.

ژیانی ڕۆژانەی ئێوە پەرستگا و ئاینی ئێوەیە، هەرکاتێک دەچنە ناوی، هەموو شتەکانتان لەگەڵ خۆتاندا بەرن.

گاسن و کوورە و چەکوش و عود، هەموو ئەو شتانەی بۆ پێویستیی یان بۆ خۆشحاڵیی خۆتان دروستتان کردووە لەگەڵ خۆتاندا بیبەن.

چونکە لە جیهانی خەونیشدا ناتوانن نە لەوانە سەرتر بن، کە بەدەستتان هێناون و نە لەوانەیش کەمتر بن، کە شکستتان تێدا هێناوە.

هەموو خەڵک لەگەڵ خۆتان بەرن؛

چونکە لە کاتی پەرستندا نە دەتوانن لە هیواکانی ئەوان بەرزتر بفڕن و نە لە نائومێدییەکانیان نزمتر خاکەڕابن.

ئەگەر دەتانەوێ خودا بناسن، هەوڵ مەدەن ڕازو نهێنییەکەی بزانن، بەڵکوو تەماشای دەوروبەری خۆتان بکەن، تا ببینن چۆن لەگەڵ دروستکراوەکانیدا یاریی دەکات.

لە ئاسمان بنواڕن، دەبینن چۆن بەنێو هەورەکاندا هەنگاو دەنێ، باڵەکانی بۆ هەورە برووسکە درێژ دەکات و لەگەڵ باراندا دەبارێت.

ئەو لەناو گوڵەکاندا دەبینن، پێدەکەنێت و پاشان لەناو درەختەکاندا دەیبینن دەستەکانی بەرزدەکاتەوە و ڕایاندەوەشێنێت.

لەم کاتەدا میترا* دووبارە هاتەوە دەنگ و وتی: "ئێستا دەمانەوێت دەربارەی مەرگ پرسیارت لێ بکەین؟"

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ئێوە دەتانەوێت نهێنیی مەرگ بزانن، بەڵام ئەم نهێنییەتان چۆن دەست دەکەوێت، جگە لەوەی لە دڵی ژیاندا بەدوایدا بگەڕێن؟

کوندەپەپوو چاوە شەوگەڕەکانی لە ڕۆژدا کوێرەو سەر لە ڕووناکی دەرناهێنێت، ئەگەر بەڕاستی دەتانەوێ ڕۆحی مەرگ ببینن، ئەوا دەرگای دڵی خۆتان بۆ جەستەی ژیان بکەنەوە، چونکە ژیان و مەرگ یەکن، هەروەک چۆن ڕووبار و دەریا یەک شتن.

---

* میترا: ئەو ژنەیە، کە لە بەشی یەکەمدا لە پەرستگا دێتەدەر و چاوی بە (مستەفا) دەکەوێت و بۆ یەکەم جار گفتوگۆی لەگەڵ دەکات. (و)

لە قـوولایی ئومێـد و ئارەزووەکانتانـدا زانسـتی بێـدەنگیی ئێـوە ڕاکشـاوە، هەروەک چۆن تـۆو لەژێـر بەفـردا خەو بە بەهـارەوە دەبینێـت، دڵـی ئێـوەیش خەو بە بەهـارەوە دەبینێـت. متمـانە بە خەونەکانتـان بـکەن، چـونکە دەروازەی هەتاهەتایی لە خەونەکاندا شاردراوەتەوە.

ترسـی ئێـوە لە مەرگ، لەرزینـی ئەو شـوانەیە کە لەبەرانـبەر پادشـایەک ڕاوێسـتاوە، تـا میدالی شـانازیی لەسـەر شـانی دابنێـت. ئایا شـوان لەژێـر ئەم لەرزینەیـدا، خۆشحاڵ نییە، لەوەی کە میـدالی شـانازیی پادشـا بە قەدیـیەوە دەکـرێ؟ لەگەڵ ئەوەیشـدا ئایـا شـوانەکە هەر خەیـاڵی لەلای لەرزینـی خـۆی نییە؟

ئینجا مـردن چییە، جگە لە ڕووت ڕاوەسـتان بەرانـبەر (بـا) و تـوانەوە لەژێـر خـۆردا؟ لەهەناسـەکەوتن چـیـیە؟ جـگە لە ئـازادکردنی هەناسـە لە هەڵکشـان و داکشـانی بێسـرەوت، کە ئیـدی وەهـا فـراوان ببێـت و بەرزببێـتەوە، بـێ هـیچ بەربەسـتێک بەدوای خوداوەنـددا بگەڕێت؟

تەنها ئەوكاتەی ڕووباری بێدەنگیی دەخۆنەوە
دەتوان بەڕاستی گۆرانی بڵێن. تەنها ئەوکاتە
کە دەگەنە ترۆپکی چیایەک، سەرکەوتن
بەسەر چیاکەدا دەست پێ دەکەن.
ئەو کاتەیش زەوی جەستەی ئێوە بانگ
دەکات، ئەوکاتە بەڕاستی دەکەونە
سەماکردن.

ئێستا ئیدی شەو داهاتبوو. میترا جارێکی تر هاتەوەگۆ و وتی: "پیرۆز بێت ئەم ڕۆژە و ئەم شوێنە و ئەو ڕۆحەی بۆمان دوا."

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

ئایا من بووم بۆ ئێوە دوام؟

مەگەر خۆیشم گوێگر نەبووم؟

ئەمرا بە پلیکانەکانی پەرستگاکەدا هاتەخوارە و خەڵکەکەیش شوێنی کەوتن تا گەیشتە لای کەشتییەکە و ئینجا سەرکەوت و لە ناوەندی کەشتییەکەدا ڕاوێستا و ڕووی کردەوە خەڵکەکە، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس، (با) داوام لێ دەکات جێتان بهێڵم، ئەگەرچی هێندەی (با) تیژڕەو نیم، بەڵام هەر دەبێت بڕۆم.

ئێمەی گەڕیدە، هەمیشە ویڵی ڕێگا تەنیاکانین، هیچ ڕۆژێکمان لەهەمان شوێندا دەست پێ ناکەینەوە، کە دوێنێ تێیدا

وەستابووین و هیچ خۆرێکیشمان لە هەمان ئەو شوێنەدا لێ هەڵنایەت کە لێمان ئاوابووە. تەنانەت ئەو کاتەیشی زەوی دەنوێت، ئێمە هەر دەڕۆین، ئێمە تۆوی ئەو گیا چەسپاوەین، کە لە پێگەیشتوویی و پڕیی دڵمان دەبەخشینە با، تا بڵاوی بکاتەوە.

ڕۆژەکانم لەنێو ئێوەدا کورت بووە و کەمترین قسەم بۆ کردن، بەڵام ئەگەر دەنگی من لەگوێتاندا نەما و خۆشەویستیی منتان لەیاد کرد، ئەو کاتە دووبارە دەگەڕێمەوە بۆ لاتان و بە دڵێکی دەوڵەمەندتر و زمانێکی ئاشناتر بە ڕۆح قسەتان بۆ دەکەم.

بەڵێ، من لەگەڵ هەڵکشان و داکشانی شەپۆلدا دێمەوە، هەرچەندە ڕەنگە مەرگ بمشارێتەوە و بێدەنگییەکی مەزن لەخۆیم بگرێت، وێڕای ئەوەیش دووبارە هەوڵ دەدەم لەگەڵ تێگەیشتنتاندا بدوێم.

هەوڵەکەم بێهوودە نابێت.

ئەگەر ڕاستیی لەوەدا هەبێت، کە پێم گوتوون، ئەوا ئەو ڕاستییە خۆی لە دەنگێکی ڕۆشنتردا دەردەخات، بە زمانێک کە لە ئەندێشەتانەوە نزیک بێت.

ئەی خەڵکی ئۆرفالیس، من لەگەڵ (با)دا دەڕۆم، بەڵام نەک بۆ ناخی بەتاڵایی. ئەگەر ئەمڕۆ خواستی ئێوە بەدیی نەهاتووە و خۆشەویستیی من لێوڕێژ نەبووە، با ئەمە بەڵێن بێت بۆ ڕۆژێکی تر، بزانن کە من لە بێدەنگییەکی مەزنتردا دەگەڕێمەوە.

ئەو تەمەی بەرەبەیان دەڕەوێتەوە و شەونمی خۆی لە کێڵگەکاندا جێ دەهێڵێت، بەرز دەبێتەوە و دەبێت بە هەور، ئەوجا لە شێوەی باراندا دەبارێت. منیش وەک ئەو تەمە وام، لە بێدەنگیی شەودا بەنێو شەقامەکانتاندا ڕۆیشتووم و ڕۆحی من هاتۆتە نێو ماڵەکانتانەوە.

ترپەکانتان لەگەڵ ترپەی دڵمدا بووە و هەناسەکانتان بەر ڕووخسارم کەوتووە، من هەمووتانم ناسیوە. بەڵێ، شادیی و ئازارتان دەزانم و لە خەوەکانیشتاندا خەونەکانتان هی من بووە.

زۆرجار لەنێو ئێوەدا وەک دەریاچەیەک بووم لەنێو چیایەکدا. بەرزیی و نزمیی، ترۆپک و لێژاییەکانتان لەنێو مندا وێنەی داوەتەوە، تەنانەت تێپەڕینی ئەندێشە و ئارەزووەکانیشتان.

پێکەنینی منداڵەکانتان وەک جۆکە و خواستی لاوەکانتان وەک ڕووبار ڕژاونەتە بێدەنگیمەوە، کاتێکیش ئەم جۆگە و ڕووبارە گەیشتنە قووڵاییم، لە گۆرانیگوتن نەکەوتوون، بەڵام لە پێکەنین شیرینتر و لە خواست مەزنتر ڕژاونەتە منەوە.

ئەمەیش کە تێتاندا ناکۆتاییە، مرۆڤێکی مەزنە کە ئێوە لە نێویدا خانۆچکە و تەڵەزمن، هەموو گۆرانییەکانتان چ نییە جگە لە یەک ترپەی دڵی.

لەنێو ئەم مرۆڤە گەورەیەدایە، کە ئێوە گەورەن، لەنێو ئەمدا بوو من بینیمن و خۆشمویستن.

چونکە خۆشەویستیی دەگاتە هەموو دامێن و ئاسۆ دوورەکانی ئەم جیهانە مەزنە، کام خەون و کام هیوا و کام گومان دەتوانێ بەرزتر بێت لەم فڕینە؟

ئەم مرۆڤە مەزنەی کە لە ئێوەدایە، وەک درەختی بەڕوو وەهایە، کە چرۆی سێوی گرتبێت، هۆشی ئەو بە عەردتانەوە دەنووسێنیت و عەتری ئەو دەتانبات بۆ ئاسمان و لەنێویدا نەمرتان دەکات.

پێتان دەڵێن: ئێوە وەک زنجیر وان، لاوازن وەک لاوازترین ئەڵقەی زنجیرەکە. بەڵام ئەوە نیوەی ڕاستییەکەیە، نیوەکەی تری ئەوەیە، ئێوە بەهێزن وەک بەهێزترین ئەڵقەی زنجیرەکە.

پێوانەکردنی خۆتان بە بچووکترین کردەوە، وەک ئەوە وایە هێزی زەریا بە ناسکی کەفێکی پێوانە بکەیت. داوەرییکردنی ئێوە بەپێی شکستەکانتان، وەک گللەییکردنە لە ناسازگاریی وەرزەکانی ساڵ.

بەڵێ، ئێوە وەک ئۆقیانووسن، هەرچەندە کەشتییە بارقورسەکان لە کەنارتاندا وێستاون و چاوەڕێی شەپۆلەکانتانن، بەڵام هێشتا هەر وەک ئۆقیانووس ئێوە ناتوانن هەڵچوون و داچوونەکانتان تاو بدەن و پەلە لە شەپۆلەکانتان بکەن.

هەروەها وەک وەرزەکانیشین، هەرچەندە لە زستاندا نکووڵی لە بەهارتان دەکەن، کەچی هێشتا بەهار بە خەواڵوویی لەناوتاندا پێ دەکەنێ و لێتان ناڕەنجێت.

وا نەزانن بۆیە ئەمە دەڵێم تا لەنێو خۆتاندا بە یەکتر بڵێن: "بە چاکە ستایشمان دەکات و تەنها باشییەکانمان دەبینێت."

نەخێر، تەنها ئەوەندەیە من بەو وشانە لەگەڵتان دەدوێم، کە ئاشنایە بە دڵتان.

زانین چییە، جگە لە سێبەری نەوتراوی زانین؟ ئەندێشەکانی ئێوە و وشەکانی من شەپۆلی یادگەیەکی سەربەمۆرن، کە تۆماری دوێنێمانی لەخۆیدا هەڵگرتووە.

یادگاریی ڕۆژانی زوو، ئەو کاتەی زەوی نە ئێمەی دەناسی و نە خۆی، یادگاریی شەوانێک کە زەوی گۆیەکی قژقژی ئاڵۆزاو بوو.

حەکیمی تر هاتوون تا لە حیکمەتی خۆیان بە ئێوە بدەن، بەڵام من هاتووم حیکمەت لە ئێوە ببەم. ئەوەی دۆزیمەوە مەزنترە لە دانایی. ڕۆحێکی گڕداری نێو ئێوەیە، کە تادێ بڵێسەدارتر دەبێ، لەکاتێکدا ئێوە بێئاگا لە تەشەنەی ئەم ئاگرە، بەدەست بەختی کۆڵتانەوە زاریی دەکەن.

ئەمە هەمان ژیانە کە بەدوای ژیان لە جەستەیەکدا دەگەڕێت و لە گۆڕ دەترسێ، بەڵام هیچ گۆڕێک لەگۆڕێ نییە.

ئەم چیا و دەشتانە لانکە و پلیکانەن، کاتێ بەتەنیشت ئەو کێڵگانەدا دەڕۆن، کە باوباپیرانتانی تێدا نێژراوە، بەوردیی لێی

بڕوانن، خۆتـان و منـدالەکانتان دەبینن دەست لەناو دەست خەریکی سەمان.

لەڕاسـتدا ئێـوە زۆرجـار لە شـادییەکانتان بێئاگـان. ئەوانیتـر دێـن و بەڵێنـی زێـڕین و قەبەتـان پـێ دەدەن، ئێـوەش سـەروەت و هێـز و شکۆیان پـێ دەبەخشـن. مـن هـیچ بەڵێنـێکم پـێ نەدان، کەچـی لەوانیتـر زیـاتر بەخشیندەتربوون لەگەڵم.

ئێـوە تینـوێتی منتـان بـۆ ژیـان زیـاتر کـرد. بەدڵنیـاییەوە هـیچ دیـارییەک بـۆ مـرۆڤ هێنـدەی ئەوە مەزن نیـیە، کە هەمـوو ئامانجەکـانی ببنـە لێـوێکی وشـک و تینـوو و ژیانیش بۆی ببێتە کانی.

لەوەیشـدا خەڵات و شـانازییم هەیە. هەر کـاتێ بـۆ ئـاوخواردنەوە دێـمە سـەر ئەم کـانییە، دەبیـنم ئـاوەکە خـۆی تینـووە و پێشـم دەکەوێ، کەمـن دەیخـۆمەوە ئەویـش دەمخواتەوە.

هەنـدێک لە ئێـوە پێتـانوایە لەخـۆم ڕازییم و شـەرم دەکەم دیـاریی قبـووڵ بـکەم. لەڕاستیدا لەخۆڕازیبـوونم، ڕێـگە نـادات کـرێ وەربگـرم، نەک دیاریی.

هەرچەندە لەنێو ئەم کردانەدا لەگەل ئێوە دانیشتووم و تووترکم خواردووە. لە حەساری پەرستگادا نووستووم، کاتێ بەخۆشحاڵییەوە پەناتان داوم. لەگەڵ ئەوەیشدا مەگەر هەر میهرەبانیی و خۆشەویستیی ئێوە نەبوو شەو و ڕۆژ نانی لەزاری مندا شیرین دەکرد و خەوەکانمی پڕ لە خەونی ڕەنگین دەکرد؟

من بۆ ئەمە نزای چاکەتان بۆ دەکەم:

زۆر دەبەخشن و نازانن، کە هەموو شتێک دەبەخشن. لەڕاستیدا ئەو میهرەبانییەی لە ئاوێنەدا دەڕوانێتە خۆی، دەگۆڕێ بۆ بەرد. ئەو کردەوە چاکەی بە ناوی ناسک خۆی بانگ؛ دەکا دەبێتە نەفرەت.

هەندێک لە ئێوە بە گۆشەگیر و مەستی تەنیایی ناوم دەبەن و دەڵێن: "ئەو لەگەڵ دارەکانی دارستاندا دۆستایەتی دەکات، نەک لەگەڵ مرۆڤدا. بەتەنها لەسەر لووتکەی گردەکان دادەنیشێت و لە بەرزاییەوە لە شارەکەمان دەڕوانێ."

ڕاستە بەسەر گردەکاندا هەڵزناوم و چوومەتە شوێنە دوورەکان، بەڵام چۆن دەتوانم بتانبینم جگە لەوەی لە بەرزاییەکی زۆرەوە و لە دوورییەکی بێ ئەندازەوە تەماشاتان

بکەم؟ ئینسان چۆن دەتوانێ نزیک بێ هەتا دوور نەبێ؟

هەندێکی ترتان بەبێ وشە ناوا ناوم دەهێنن:

"غەریب، نامۆ، عاشقی بەرزاییە دەست پێ نەگەیشتووەکان، بۆ لەسەر ئەو لووتکانە نیشتەجێ دەبیت، کە هەڵۆکان هێلانەی لێ دەکەن؟ بۆچی بەدوای شتێکی دەست نەکەوتەدا دەگەڕێیت؟ لەداوی چ گەردەلوولێکدا گیرت خواردووە؟ دەتەوێ چ باڵندەیەکی تەمئاسا لەئاسماندا ڕاو بکەیت؟ وەرە و ببە بە یەکێک لە ئێمە، دابەزە و برسێتیی خۆت بە نانی ئێمە تێر بکە و تینوێتیی خۆت بە شەرابی ئێمە بشکێنە."

لە تەنیایی ڕۆحی خۆیاندا ئەم شتانە دەڵێن:

بەڵام ئەگەر تەنیاییەکەیان قووڵتر بایەتەوە، دەیانزانی کە من جگە لە نهێنیی شادیی و خەمەکانیان بەدوای هیچی تردا نەگەڕاوم و جگە لە خودی گەورەتری ئێوە، هیچی دیم لە ئاسماندا ڕاو نەکردووە، بەڵام بزانن ڕاوکەر خۆیشی ڕاوکراوە. زۆرێک لە تیرەکانم تەنها بۆ ئەوە لە کەوان دەرچوون تا لە سینگی خۆم بچەقن.

باڵندەیش هەر خشۆکە، چونکە کاتێ لەنێو خۆردا باڵەکانم دەکردەوە، سێبەرەکانیان لەسەر زەوی دەبوو بە کیسەڵ.

من هەم باوەڕدارم، هەم گومانکار.

چونکە زۆرجاران، پەنجەم خستۆتە برینی خۆمەوە تەنها لەبەر ئەوەی بڕوام بە ئێوە زیاتربێت و ئێوە زیاتر بناسم.

بەهۆی ئەو باوەڕ و زانینەیە، کە دەڵێم ئێوە نە لە جەستەی خۆتاندا دیلن و نە لە ماڵ و کێڵگەکانتاندا قەتیس کراون.

ئێوە کە لەسەر چیاکان نیشتەجێن و لەگەڵ باکاندا دەگەڕێن، مانای ئەوە نییە بۆ گەرمیی بخشێن بۆ نێو خۆر و بۆ سەلامەتیتان توونێل بەنێو تاریکییدا لێ بدەن، بەڵکوو مانای ئازادیی ڕۆحێکە زەویی دەتەنێ و بە گەردووندا دەخوولێتەوە.

ئەگەر ئەم وشانە بۆتان تەمومژاوییە، هەوڵی ئەوە مەدەن تەمەکەی لێ بڕەوێننەوە {سادەی بکەنەوە}. تەمومژ و پەنهانیی سەرەتای هەموو شتێکە، بەڵام کۆتاییەکەی نییە.

خۆشحاڵ دەبم ئەگەر ئێوە منتان وەک سەرەتایەک لە بیر بێت. ژین و ژیان لە

تەمومژدا وێنا دەبێ، نەک لە بلووردا. کێ هەیە نەزانێ ئەم تەمومژە، هەر هەمان بلوورە و شی بۆتەوە؟

ئەمانە بیر خۆتان بهێننەوە کاتێک منتان بیردەکەوێتەوە:

ئەوەی لەناو ئێوەدا وا دەردەکەوێت لاوازترین و شلەژاوترینە، لەڕاستیدا بەهێزترین و جێگیرترینە.

هەر هەناسەتان نییە، کە دارشتەی ئێسکەکانتانی دروست و پتەو کردووە؟ هەر ئەو خەونە نییە -کە لەیادی هیچ کەسێکتان نییە کەی بینووتانە- شارەکەتان و هەموو شتەکانی ناوی بونیاد ناوە؟

ئەگەر بتانتوانیبا هامشۆی هەناسەتان ببینن، هیچی ترتان نەدەبینی. ئەگەر بتانتوانیبا چرپەچرپی خەونەکانتان ببیستن، ئیدی هیچی ترتان نەدەبیست، بەڵام نە دەیبینن و نە دەیبیستن، ئەمەیش شتێکی چاکە.

ئەو پەردەیەی کە بەری چاوانتانی گرتووە، دەبێ هەر بەو دەستانە لاببرێ، کە چنیویەتی. ئەو گڵەی پەستێوراوەتە گوێتان، دەبێ هەر بەو پەنجانە دەربکێشرێ، کە تێی پەستیووە، تا بتوانن ببینن و ببیستن.

وێڕای ئەوەیش نە نابینایيتان پێ ناخۆش بێت و نە لە نابیستەیی پەشیمان ببنەوە، چونکە ئەو ڕۆژەی مانای نهێنیی شتەکان تێ دەگەن تاریکییش ستایش دەکەن، هەروەک چۆن ڕووناکیی ستایش دەکەن.

لە پاش ئەم قسانە تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، ناخوداکەی* لەپشت سوکانی کەشتییەکەوە بینی، گاهێ لە چارۆکە پڕ لە هەواکانی دەنواڕی و گاهێ لە ئاسۆی دوور.

ئەمڕا گوتی:

چ ئارام و بەسەبرە ناخوداکەم، با هەڵی کردووە و چارۆکەکان سرەوتیان نییە، تەنانەت سوکانەکەش چاولەڕێی فەرمانە، لەگەڵ ئەوەیشدا ناخوداکەم بە هێمنی لە چاوەڕوانیی بێدەنگی مندا وێستاوە.

دەریاوانەکانی منیش کە گۆرانیی دەریای مەزنتریان بیستووە، بە ئارامییەوە گوێقوڵاغی منن.

---

* ناخودا: کاپتنی کەشتی، کەشتییەوان. (و)

ئێستا با لەوە زیاتر چاوەڕێ نەبن، من ئامادەم. جۆگە گەیشتەوە بە دەریا و جارێکی تر دایکی مەزن کوڕەکەی بە سنگییەوە دەنێ.

ماڵئاوا خەڵکی ئۆرفالیس، ئەمڕۆ کۆتایی هات، بە ڕوومان‌دا داخرا وەک چۆن نیلۆفەری ئاویی پەڕەکانی بۆ سبەینێ دادەخات.

ئەوەی لێرە پێمان بەخشرا دەیپارێزین، ئەگەر ئەمەش بەشی نەکرد، پێویستە دووبارە هەموومان پێکەوە دەستمان بۆ بەخشەر درێژ بکەین.

لە یادی مەکەن، کە دێمەوە لاتان. تۆزێکی تر خواستی من کەف و خۆڵ پێکەوە کۆدەکاتەوە بۆ جەستەیەکی تر.

**تۆزێکی تر کە لەسەر با پشوو دەدەم، ژنێکی تر {لە سکی خۆیدا} هەڵمدەگرێ.**

ماڵئاوا لە ئێوە و لەگەنجییم، کە لەنێو ئێوەدا گوزەراندم. دەڵێی دوێنێیە کاتێ لە خەوندا یەکمان دی. ئێوە گۆرانیتان بۆ تەنیاییم چڕی و من لە خواستتان بورجێکم لە ئاسماندا هەڵچنی.

ئێستا خەومان فڕیوو و خەونەکان گەیشتنە کۆتایی، چیتر سپێدەیەک لە گۆڕێ نییە.

نیوەڕۆ کەیوەتە سەرمان، نیوەی وشیاریی ئێمە، ڕووی لە ڕۆژێکی تەواوترە و دەبێ جیا ببینەوە.
ئەگەر لە ئاسۆی یادەوەرییدا، جارێکی دی یەکترمان بینییەوە، دووبارە بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەین و ئێوە گۆرانییەکی قووڵترم بۆ دەچڕن.
هەرکاتێک دەستەکانمان لە خەونێکی دیکەدا بەریەک کەوتن، بورجێکی تر لە ئاسماندا دروست دەکەین.

کە قسەکانی تەواو کرد ئاماژەیەکی بۆ دەریاوانەکان کرد، ئەوانیش خێرا لەنگەریان هەڵکێشا و کەشتییەکەیان لە پێوەندەکانی کردەوە و بەرەو خۆرهەڵات کەوتنە ڕێ.
خەڵکەکە هاواریان کرد وەک ئەوەی لە یەک دڵەوە هاوار بکەن، دەنگیان لەگەڵ زەردەپەڕدا هەڵکشا و وەک ئاوازی کەڕەنایەکی مەزن بەسەر دەریادا بڵاوبۆوە.
تەنیا میترا بێدەنگ بوو، لە کەشتییەکەی دەڕوانی تا لەناو تەمدا دیار نەما. کاتێکیش هەموو خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد، ئەو هێشتا بەتەنیا لەسەر بەستی بەندەرەکە ڕاوێستابوو

لە دڵـی خۆیـدا بیـری لە قسـەکەی ئەو دەکردەوە:

"تـۆزێکی تـر کە لەسـەر با چشـوو دەدەم، ژنێکی تر {لە سکی خۆیدا} هەڵدەگرێ."

-کۆتایی-

# پێڕست

## کتێبەکانی تری وەرگێڕ:



### توانا ئەمین

- کچی ناو تابلۆکە (چیرۆک) ٢٠٠٨
- پیاسەیەک پێکەوە.. پیاسەیەک بەتەنیا (ڕەخنەی ئەدەبی) ٢٠٠٨
- مەنفا و خوێندنەوە (گفتوگۆی ئەدەبی) ٢٠٠٨
- پەیکەری فەرهاد، ڕۆمان، عەباس مەعرووفی (وەرگێڕان) ٢٠٠٩
- خودا لەسەری مرۆڤدا (گفتوگۆی فیکری) ٢٠١٢
- سەگێک لە ئاوێنەدا (چیرۆک) ٢٠١٢
- فڕین لە قەفەسێکی کراوەدا (ڕەخنەی ئەدەبی) ٢٠١٢
- کەوتن، ڕۆمان، ئەلبێر کامۆ (وەرگێڕان) ٢٠١٣
- ماچێک بە تامی خۆڵەمێش، شیعر (وەرگێڕان) ٢٠١٤
- کوندەپەپووی کوێر، ڕۆمان، سادق هیدایەت (وەرگێڕان) ٢٠١٥
- ماڵی یار، سوهراب سپێهری (وەرگێڕان) ٢٠١٥
- مینای شین (نووسین) ٢٠١٦
- تریفەی مانگ، مۆپاسان (وەرگێڕان) ٢٠١٦
- ژولیا و دەستنووسەکەی مەولانا (چیرۆک) ٢٠١٦
- گەردانەی تەم، سوهراب سپێهری (وەرگێڕان) ٢٠١٦
- پەیامبەر، ئەدەبی فەلسەفی، جوبران خەلیل (وەرگێڕان) ٢٠١٧

ئەم کتێبە پێکهاتووە لە ٢٨ گوتاری شاعیرانە دەرباری ژیان و خوشەویستی و هاوسەرێتی و مندال و سامان و بەخشین و.... لەسەر ئاستی فۆرم و تەکنیک سادە و لە ئاستی ناوەڕۆکدا قوول و قژقژە. کتێبێکە بۆ هەموو کەسێك دەشێت لە هەر تەمەنێکدا بێت و سەر بە هەر ئاینێک بێت، ئەم کتێبە دوای ئینجیل پڕفرۆشترین کتێبی سەدەی بیست بووە، بەجۆرێک هەتا ئێستا هەفتانە ٥٠٠٠ نوسخەی لە سەرانسەری جیهاندا لێ دەفرۆشرێت و بۆ زیاتر لە ٥٠ زمانی جیهان وەرگێڕدراوە.

دکتۆرێکی وانەبێژی ئەدەبیات لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەبارەی ئەم کتێبەوە نووسیوێتی: "ئەمە کتێبێکە لە ساتی زۆر گرنگدا بە فریات دەکەوێ، باشترین کتێبە وەک دیاری لەدایکبوون، یان دیاری دۆستانە لەنێوان دوو خۆشەویست یان دوو هاوڕێدا ببەخشرێت."

# The Prophet

**Gibran Khalil Gibran**

Translated by :Twana Amin

لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی